


ناو :  پەیامی دڵ

بابەت : شیعر

نوسەر : ئیسماعیل یاسین

دیزاین : نیگا ئەحمەد

پێداچونەوە : د.سۆران مامەند

تیراژ : ٥٠٠ دانە

نۆرەی چاپ : یەکەم٢٠٢٣

چاپ: چاپخانەی ڕێنما

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە

گشتییەکان/هەرێمی کوردستان ژمارەی

سپاردنی (٥٠٤) ساڵی ٢٠٢٣ ی پێدراوە

# پێشەکی

لــەدوای بەدەســت هێنانــی کەســێک،دوای بەدەســت هێنانــی هاوبەشــێک بــۆ ژیانم.ســەرەتایەکی جــوان ئاڕاســتەم هات،تــا کۆتــا کاتەکانــی کــە خەیاڵەکانــم هەڵفڕیــن بــۆ ئاســمانێکی بــەرز، هەمووکاتێکــی هەرزەکاریــم تەنهایــی بــوو ئامانجــم بەدەســت هێنانــی خەونەکانــم بــوو، بــەڵام ئــەو کاتــەی مــن هەوڵــم بەدەســت هێنانــی خەونەکانــم بوو،لەلایــەن ئازیزانێــک هەوڵــی تێکدانــی درا مــن دوای تەنهاییــم تەنهــا خاوەنــی قەڵەمێــک و پەڕەیەکــی ســپی بــێ گیانم،مــن تەنهــا هەوڵــی نوســین و ئەنجامــی کۆتاییــم دەکرد،تــا وای لێهــات گەیشــتم بــە پەیامــی دڵــم.

هــەر کەســێک لــە ئێمــە دونیایــەک قســە لــە دڵــمان هەیە،لــە ژێــر ئــەو کەســایەتییەی کــە هەمانە،گەردوونێــک وشــەی جادوویــی بونــی هەیە،پەیامــی دڵــم دەگەیەنــم بــە هەمــوو ئــەو کەســانەی کەچارەنــووس ســتەمی لــێ کــردوون.

کــە ســەرەتاکان هەمیشــە جــوان و پــڕ خەیــاڵ بــوون تــا لەنــاکاو مۆمــی هیــوا دەکوژێتــەوە و مەشــخەڵێکی پــڕ لــە پەیــام ســەرتاپای دڵــت داگیــر دەکات، منیــش لــە مەشــخەڵێک پەیامــی دڵــم ئاشــناتان دەکــەم ...

ئەگـــەر بـــۆ تۆزێکیـــش بێـــت وەفـــای خۆشەویســـتیم بـــە چەنـــد وشـەیەک لـە ئاسـتی ئازارەکانـی دابڕانـم و ئـەو عیشـقە پاکـەی کـە مـن هەمـە بۆتـۆ بـەو خەیاڵانـەی کـە هەمـە لەگـەڵ تـۆ بـە چەنـد پارچـە پەیامێکـی دڵـم بگەیەنـم بـە تـۆ .

کتێبـــی پەیامـــی دڵـــم بـــۆ هەمـــوان نوســـی لـــە ئازارەکانـــم و ڕوداوەکانـی ژیانـم و هیـواو خۆزگـەی داهاتـووم بـەو هیوایـەی ئـەو کەسـەی بـۆی نـوسراوە ڕۆژێـک بیخوێنێتـەوە بـەو هیوایـەی ڕۆژێـک بـە عیشـقەکەم بگـەم و بتوانـم ئـەم کتێبـەی بـۆ بکـەم بـە دیـاری بـە خەیاڵـی ئـەو ڕۆژەی بتوانـم یـەک بـە یەکـی ئـەم شـیعرانەی بـۆ بخوێنمـەوە پەیامـی دڵـم پێشـکەش بـە هەمووتـان و تایبـەت تـر بـە مێهنـازی جوانـی..

# پەیامی دڵ

کەگوێبیستی دەنگت دەبووم

ئاشق بە دڵ و ڕۆحت دە بووم

گەشامەوەبووم بە کوڕێك

پڕلە جوانی پڕلە باشی

ئێستاش سەیری حاڵ وژینم

چیم بەسەرهات..؟

دڵ بەند بووە نێزیك لە غەم

دوورلە باخچەی گوڵی نازناز

قەڵەمەکەم پڕدەکەم لەو

بایەی بۆنی تۆم بۆ دێنێت

یادگاری ئیشقی خۆمانی پێ دەنوسمەوە

دوو تاڵ لە برژانگەکانت دەکەم بە سەوڵ

نەوەك جوانی ڕوباری چاوانت بمخنکێنێ

ئەوەی بەم ژیانەی بەستومەتەوە

تەنیایادگارییەجوانەکانی تۆیە

یادگاری ئەو ڕۆژەی قژت بۆ دەکردمە چەتر

دەستگرتنیشت بۆ پاڵپشتی و پێکەنینیشت
بۆم وەك جوانترین تابلۆی ژین
ئەزیزەکەم دونیا پڕە لە خانمی
جوان و شۆخ و شەنگ و نازدار،
بەڵام من ئەو پەپولەیەم بۆ یەك گوڵ
بومە سەرخۆش و مەست و بێ حاڵ
ئەو پوپولەیەی لە دەوری یەك گوڵ دەخولێتەوە
و تۆش ئەو گوڵەی تەنیا بۆ من دەکرێیتەوە
تۆ ئەو گوڵەی بە هاتنت لە پایزیش دا
ژینم دەکەی بە گوڵزار،
دونیا هەمووی نابێ بە گوڵ تا تۆ بیرەدا تێنەپەڕی
دونیا نابێ بە فەرهەنگی پڕلە خەم و ئێش و ئازار



## پەیامی دڵ

گەرتۆ لە شەقامی غەریبیدا تەنیام نەکەی ،

خۆزگە بۆ قژت شانەیەك بوام

یانیش بۆ وەسفی جوانیت شاعیرێك بوام

یانیش بۆ ژێر باران چەترت بوام

نەوەك لە پایزی عومرمدا توشی ئیشقی کچێك بوام

و زاڵمێك حاڵی پەرێشان بکردبام

دەچمە ناو سەوزایی باخچەکان

بەڵکوو بە ڕەنگی چاوانت ئاشنا بم

لە شەوانی تەنیایم دا ڕودەکەمە مانگ،

چونکە تۆی تێدا دەبینم

دەچمە لای ئەو گەڵا هەڵوەریوانەی پایز،

بەڵکوو چیرۆکی عیشقم بۆ بنوسنەوە

چیرۆکی ئەو عیشقەی بەدکارێك

لە یەکی دوورخستینەوە،

کەسێك هەیە لە دڵم دا

کە هەمیشە بیری لێدەکەمەوە

و حاڵم پەرێشان بووە بۆی
کەسێك هەیە، کە هەموو ڕۆژ نامەی بۆ دەنێرم
و بەڵام ئەو نامانە هەرگیز ناکرێنەوە
سکاڵای دڵ و غەمی ژینم وەك شیعرێك دەنوسم،
بەڵام هەرگیز ناخوێندرێنەوە
داخی گرانم بۆ ئەو نامانەی کە هەرگیز ناکرێنەوە
داخی گرانم بۆ ئەو شیعرانەی کە هەرگیز ناخوێندرێنەوە
ئاخ لەو ڕۆژانەی کە قەت ناگەڕێنەوە
ئاخ لەو ژیانەی، کە تا ئەبەد
خەمی دڵم نابڕێتەوە
خەمی دوری تۆ برینێکە لە بێ تۆیدا
بۆ هەمیشە،ئەکولێتەوە..



# دواین ژوان

گەرزانیبام دوای ئەمڕۆژە

جارێکی ترتۆ نابینم

دواین ژوانە و جارێکی تر

لە چاوانت ڕانامێنم

من ئەم ڕۆژە لە باوەشتا

خەوی مەرگ دایدەگرتم

لە چاوانتا دیل دەبووم و

لەسەرشانت بە زوڵفی تۆ

دەمامەوە و نەدەسرەوتم..



# له چی بگه‌م..؟

له چی بگه‌م،كه ئه‌و دڵه‌م هێشتا په‌رێشانه
له چی بگه‌م،كه ئه‌و عیشقه‌م
سه‌ودا سه‌ره و بێ ناونیشانه
ئاخرمن چی بكه‌م،كه تۆ له عیشق و له من ناگه‌ی
تاوانباری
له ڕۆژی دوای له‌به‌رده‌م خودا
شه‌رمه‌زاری
دوو دڵت لێك كرد
كه هه‌ركه‌سه و ئه‌وی تری
به دونیای خۆی ده‌زانی..



# تۆ چوزانی..؟

دەڵێن تۆ شێت و دێوانەی چ دەردێکی
وا ناخت سوتاوە،چاوەڕێی چ قەولێکی..؟
دەڵێن بەم گەنجییە بۆ وات بەسەرخۆت هێناوە
ئەوە یارت لە خۆشییە،هەرئاگاشی لێت نەماوە
تۆ چوزانی خەمی دووری مانای چییە..؟
شەوێك وەرە،لە ناو دڵمدا بەسەربەرە
ئینجا دەزانی خەمی دونیا مانای چییە
مەڵێن ئەوەی لە دڵتە قەت پێی ناگەی
لەوانەیە ڕۆژێك بەدەم خۆشی و شوكرانەوە
بڵێم خودا كردی بەڕاستی..



# 02:02AM

نازۆکەم

بۆ نازی لێکدانی پێڵویەکی چاوت

بۆ هەموو ئاسمان دەچم

بە نازی ناسك،هەروەك گوڵت

بۆ نێو پیاسەی باخچەکان دەچم

بۆ یادی شەوانی زوو ٠٢:٠٢AM

بۆ نێو یادگارییەکان دەچم

لەگەڵ تۆ بم لە باش دەچم

تۆ داوای بکەی

بۆ مەرگیش دەچم..



# گەر من و تۆ بەیەک بگەین

گەرمن و تۆ بەیەك بگەین

دەریای خەممان وشك ئەكا

دەریای عەدل سەر دەرەكا

ئەوەی پێمان ناحەزبوو

غەرقی ئەكا

گەرمن و تۆ بەیەك بگەین

هیچ بایەك نامان لەرزێنێت

لە ناخۆشییەكانی ژیان

هیچ هێزێك نامان تۆرێنیَ

گەرمن و تۆ بەیەك بگەین

ئەوسا بەهار سەردەردێنیَ

لەگەڵ شاد بونەوەی ئێمە



ئیسماعیل یاسین

پایز ڕەنگی بەهار دەگرێ
ئەوسا چۆلەکەی ئاسمانیش
بە هێمنی دەچریکێنێ
لەگەڵ هەموو شەو شادێکدا
مانگ چاوت لێ هەڵ ناگرێت
بەغیلە بە جوانی تۆ،
ئۆقرە ناگرێ
لەگەڵ هەموو بەیانییەکدا
خۆر زوو هەڵدێ،
بە دزییەوە چاوت تێدەبڕێ
لەگەڵ هەستانت لە خەو بایەك دێت و
پرچەکانت لێم ئەخشێنێ
وجودم لە تۆ دەئاڵێنێ،
ڕێژنەی ماچ بەسەرمان دەبارێنێ
لێومان لەسەر لێوی یەك،
هەناسەمان تێکەڵ بەیەك دەبێ
ئیتر قەدەر بە تۆم شاد کات

٥

هیچی ترم لێی ناوێ

بە سێدارەی قژتا هەڵمواسە،

لە خۆتم دورمەخەرەوە

لەسەرسینەت بملاوێنە ، ئاگات لێم بێ

بمگریەنە و پێکەنینیشم بدەرێ

ماچم بکە و خۆشمت بوێ

بمکوژە و زیندوم کەوە

هەرتۆم دەوێ..




٥

# بەیانیت باش

بەیانی باشم لێ بکە و سەیرم بکە

با ئەم بەیانییە نوقمی نیگای چاوت ببم

خەو لە چاوم بتۆرێنە

خەم لە ژیانم بڕەوێنە

پەنجەرەکە بکەرەوە

بە جوانیت دڵی خۆریش دەرکە

بەیانیت باش سەیرم بکە و ماچم بکە

وەك کۆرپەیەك بملاوێنە

وەك بووکە شوشەیەك لە باوەشتا هەڵم گرە

ماچم بکە و سەیرم بکە

جارجاریش نازم هەڵبگرە،

کە توڕەش بوویت بەسەرما هاوار بکە

دیسانەوە سەیرم بکە و ڕۆژێکی تر

بەیانی باشم لێ بکە..



# خۆشەویستم

خۆشم دەوێیت،بەڕادەی دایکێك بۆ کۆرپەکەی
خۆشم دەوێیت،وەك فەرهادێك بۆ شیرینەکەی
وەك مەجنونێك بۆ لەیلاکەی
وەك مەمێك بۆ خاتوو زینەکەی
وەك منێکی عاشق،بۆ خاتوونە بچکۆڵانەکەی
خۆشم دەوێی،
وەك چۆن گەردوون دوری بێ کۆتاییە
وەك چۆن ئەستێرەکان لە ژمارە نایە
وەك چۆم زەریاکان لە بن نایە
ئەوینی ئێمەش بێ کۆتاییە
خۆشەویستی ئێمە بۆ یەك ،
بە وێنەی بیابانێکی وشك و بارانێکی بێ کۆتاییە
بە وێنەی ماسییەکی توێنوو ئاوێکی پاك و بێگارد دایە
خۆشەویستیم بەبێ سنوربۆ وەسفی تۆ لە کار دایە

تا ئەو ڕۆژەی لە ژین بژین،ئەوینی من بۆتۆ وایە

ئەو ڕۆژەشی کەوا مردین

لەو دونیا ژیانێکی ئەبەدی

لە ڕێگایە..



# خۆشم دەوێیت

خۆشم دەوێیت،بە پانتایی ئاسمانەکان

خۆشم دەوێیت،بەقەد هەموو ئەستێرەکان

بەقەد ماسی و ڕووبارەکان

بەقەد دڵۆپی بارانی هەموو ڕۆژێکی زستان

خۆشم دەوێیت بەقەد مەمێك،

بەڵام نەکراوەتە داستان

خۆشم دەوێیت،وشەیەك و هەزارمانا

برینێکی سارێژنەکراو

تیرێکی لە دڵ دراو

ئەقڵێکی بێ هۆشکراو

زمانێکی بەستراو

نابێژێکی بە شاعیرکراو

جەستەیەکی ماند و شەکەت

بە بینینێکت تەواو چارەکراو

جەستەیەك بۆتۆ نەك بۆ غەیری تۆ

## ئیسماعیل یاسین

چاوێك كە غەیری چاوانت نابینێت

زمان كە غیری تۆ ناوی كەسێكی ترناهێنێت

دەستێك كە غەیری تۆ دەستی كەسێكی ترناگرێت

خۆشم دەوێیت

دڵ خۆشی من ناسینی تۆیە

مانای ژینم ناوی تۆیە

خۆشم دەوێیت،چۆن وەسفی بكەم دڵم عاشقی تۆیە

چۆن پێت بڵێم كە پێكەنینیشم بە هۆی تۆیە

خۆشم دەوێیت،

بە ڕادەیەك كە دڵ لێدانیشم بەهۆی تۆیە

دڵێك كە هی خۆمە،

بەڵام هەموو ترپەكانی هەربۆتۆیە

خۆشم دەوێیت..



# دونیا جوانە

ئازیزم،،

دونیا جوانە کە تاڵ و شیرین

خۆشی و ناخۆشی تێدایە

دونیا جوانە کاتێك بەرزی و نزمی

کەوتن و هەڵسانەوەی تێدایە

عیشقیش کاتێك جوانە

کاتێك دوو عاشقی بوێرو ڕاستگۆ

وەفادارو جەنگاوەری تێدایە

ئارام گرتنیش ئەوکاتە جوانە

کە هەموو ئەم شتانەت بەسەرهات

لە کۆتایدا خەڵاتی بەیەك گەشتنی تێدایە..



# ببە هیمن

تۆ ببە هیمن بۆت دادەگرم

گشت ئەستێرە لە ئاسماندا

بۆت دەکەم بە ملوانکە

تۆش لە ملی کە خانمی شازادە

بەڵێن دەدەم بۆت بنوسم

سەد شیعری جوان

ڕازی دڵم بدرکێنم

بیکەم بە فەرهەنگێك،بۆ عیشقی خۆمان

دەیکەم بە کتێبێك،بەناوی پەیامی دڵ

ئەو ڕۆژەی بەدەستت دێنم

وەك دیارییەك بۆت دەهێنم..



# مێهنازی جوانی

تۆ مێهنازی پڕلە جوانی

بەناوی مانگ ناو نراوی

تۆ هەم ژیانی،هەم ئارامی

هەم بە میهرەبانی پێناسە کراوی

چاوەکانت بێ دەنگ ئەدوێن

نیگاکانت زۆر شت ئەڵێن

تۆ هەم دڵی،هەم چەپکێك گوڵ

وەك دیارییەك پێشکەش بە من کراوی

موژگانی تۆ وێنەی نییە

ژیان بەبێ تۆ مانای نییە..



# دڵخۆشترین کەسم

جوانترین هەستە،کاتێك دەستتم توند گرتبێت

ژیان ئەوکاتە جوانتر دەبێت،

کە تۆی بە من شاد کردبێت

کە دەستمان لە دەستی یەك بێت

من وەك کۆت و تۆش وەك گوڵێك

کە کێشایان هێڵی سورێك

کۆڵمان نەدا بۆ هیچ کەسێك

دەستمان خستە دەستی یەك و

چیرۆکی عیشقێکمان نوسییەوە،

عیشقێك

وێنەی نەبێت

لە هیچ سەردەمێك..



#ناڵەی حەسرەت

ئەی گوڵ خونچەی باغی ژینم

ئەی شاژنی ماڵ و ژینم

ئەمشەو دڵم ناڵەی حەسرەتیەتی

گوڵی ئەمەرلیێس لە چاوانما پوشکانەوەیەتی

دەگریم و هەرخۆم دڵنەواکەری خۆمم

دەسوتێم و هەرخۆم ئارام کەرەوەی خۆمم

ئەزیزەکەم کەسێك نییە وەك من بێ بۆت

وەفاداریم شێوەی نییە

خۆشەویستیم زۆرنامۆیە

لەناو گەنجانی سەردەما

وێنەی نییە..



# 821

له هەشت ملیار کەس تەنیا تۆ کەسمی

له هەردوو دونیا تەنیا تۆ بەسمی

تۆش یەکێکی،بەڵام گشت کەسمی

تۆ جوانتری له تریفەی مانگە شەو

تۆ بۆن خۆشتری له هەڵاڵەی گوڵی گاگرۆ

تۆ فریشتەیەکی،

له ناخمدا بووی بە ئیلهام

بۆ هەزاران چاکەی دونیام..



# خۆزگە

خۆزگە دەتتوانی بێیتە ناو جەستەم
تا بە دڵ و بە چاوی من سەیری خۆت بکەیت
ئەوسا من چەند ئاشقی تۆم
تۆ دوو جارئاشقی خۆت دەبوویت
ئەوسا دەتزانی،کە چەندەم خۆشدەوێیت؟!
دەتزانی،کە چەند ئاشقتم
جارێك سەیرم کەیت سەد جار قوربانتم
گەرخۆشت بوێم من بە فیداتم
لێرە و لەو دونیاش هەربە تەماتم
زیندانی دڵتم تازە بەرنابم
من ئاشقت بووم تازە داد نادەم
سەیری تۆ بکەم قەت بێ کەس نابم
لەگەڵ تۆ بژیم من قەت پیرنابم..



ئیسماعیل یاسین

# بەخشندە ترین ئافرەت

دایەی شیرینم

لێم نێزیکی،بەڵام دایە خۆشەویستیت بێ کۆتاییە

میهرەبانییەکەت دەریایەکە و لە بن نایە

گەورەت کردین بە دەردەسەری

لە خۆت گرتەوەو بە ئێمەت بەخشی

گەنجی و جوانی خۆت لە ژێر پێی خۆت نا

تا ژیانێکت بۆ ڕۆڵەکانت پێکهێنا

دایەی شیرینم من بە فیداتم

خاك و خۆڵی ژێر پێکانتم

گۆچانم بۆ پیریت و نۆکەری داواکانتم

دایەی شیرینم ،بابەی شیرینم

چۆن دڵم بێ جێتان بێڵم

خۆم لەبەرچاوتان نەهێڵم

ژینتان بەڕێ کرد بە دەردەسەری

لە ژیان نەتان دی هیچ خۆشی و شادی..

٥

بۆ چەندین جار جەرگتان سوتێندرا
چەندین ڕۆڵەتان بە خاك سپێردرا
گەورەتان کردم ئەی بابە و دایە "
ویژدانم لە ژێر قەرزتان دایە»
بمبورن بۆ هەڵەم ئەی بابە و دایە
هەڵەم کردوو ویژدانم ئاسودەیی نایە
تاوانم کردووە لە قەتڵ گەورەتر
تاوانی ئەوەی کەوا لەبەر من
ڕێتان کەوتۆتە بەر دەرگای دوژمن
لە ڕەنج بە خەساری ئێوە دەترسام
دەنا بێ باکم لە لولەی چەکی
بەناو ڕۆشنبیر و کاکی ئەندازیار..



# باوک

باوکی شیرینم  پشت و پەنای ژینم

گەورەت کردم بە دەردەسەری

قەت ڕۆژێك سەرشۆڕی دونیات نەکردم

هەردەم سەربەرزی بابەی شیرینم

بابەی شیرینم بۆ من مامۆستای

زۆروانەی گرینگی ژیانت فێرکردم

پەروەردەی جوانت بوو بە سەرمایە

لە ژیاندا بۆ سەر ڕێگای ڕاستی بردم

زۆر هەڵەی ژیانت بۆ چاك كردم



ژیانت بەڕێ کرد بە دەردەسەری

زۆر زستانی ساردت بەڕێ کرد،

هەمووی لە گەڵای عومرت وەری

بابەی شیرینم هەردەم دەستە ماندووەکەت

لەسەر سکی تێرمان بوو

بوونت لەگەڵمان پشتوو پەنابوو

تا بمێنی بۆم بابەی شیرینم

دەست ماچکەری دەست و ئەژنۆکانتم..

# چەند خۆش دەبوو

چەند خۆش دەبوو تۆ لەلام بی

هەرخۆت هۆکاری دڵ لێدانم بی

لە خۆشی و ناخۆشی تۆ میوانم بی

هەم دەردم بیت هەم دەرمانم بی

هەم دڵ و گیان و هەم دوو چاوم بی

هەرتۆ جوانی شیعرەکانم بی

من عاشقت بم تۆ مەعشوقم بی

من فەرهاد دەبم تۆ شیرینم بی

من مەم دەبم با تۆ زینم بی

من ئاسمان دەبم بەس تۆ مانگم بی

من لە ژین دەژیم بەس تۆ یارم بی

مردنیش بێت دێم

بەس تۆم لەگەڵ بی..



ئیسماعیل یاسین

# ڕۆژی لە دایک بوون

ئەمڕۆ جوانترین ڕۆژی ساڵە

ئەمڕۆ ڕۆژێکە،کە دووبارە بونەوەی نییە

جیاوازە لە هەموو ڕۆژەکانی تر

ئەمڕۆ فریشتەیەک هاتە سەر زەوی

ئەمڕۆ مانگ و ئەستێرەیەک لە ئاسمان دابەزی

ئەمڕۆ شاجوانێک چاوی بە دونیا هەڵهێنا

شاجوانێک لەناو جوانەکان

ئەڵماسێک لەناو ئەڵماسەکان

فریشتەیەک لەناو فریشتەکان

ئەو فریشتەیە بووە مانای ژیانی من

بووە ژیانم و پێکەنینم و هۆکاری دڵخۆشی

و هەناسەدانم ئەو فریشتەیە بوو

بە خەمڕەوێنی دڵم

ئەو فریشتەیە تۆیت خۆشەویستم

لەم ڕۆژەدا خودا گرانبەهاترین دیاری

بە من بەخشیوە  کە ئەویش تۆیت

٥

چۆن گەورەیی ئەم ڕۆژەت پێ بناسێنم..؟
چ دیاریەکت بۆ بهێنم..؟
تەنها دڵێك شك ئەبەم کە بە شایەنتی بزانم
ئەویش لەگەڵ گوڵێکی سوردا بە دیاری بۆتی دێنم
ڕۆژی لە دایك بونت لێ پیرۆز ئەکەم و
هیوای تەمەنێکی درێژو پڕلە خۆشی و شادیت بۆ ئەخوازم
خۆشم دەوێیت..



ئیسماعیل یاسین

# چی لەوە خۆشتر هەیە..؟

چی لەوە خۆشتر هەیە کە تۆم هەیە،

تۆ کە مانات بەخشی بە ژیانم

لەنێو ئازارو خەمی دونیا

ئێستاکانە بەس تۆم هەیە

تۆ کە فێری خۆشەویستییت کردم

ئێستا تۆی شاژنی نێو ماڵەکەم

وەك تاجێك لەسەری خۆمت دەکەم..



# خۆشەویستی

من پێش ئەوەی تۆ بناسم

خۆشەویستی دوو کەسی پاك

لام درۆ بوو،بونی نەبوو

کە تۆم ناسی ئینجا زانیم

خۆشەویستی مانای ژیانە

ئینجا زانیم ژیان بەبێ تۆ،

چەند وێرانە..



# تۆ

تۆ ئەو کەسەی هەموو ساتێك دڵم داوای دەکا

تۆ ئەو کەسەی کە شیعریشم،

هەربە خەیاڵ بانگت دەکا

تۆ هاوڕێمی گوێم بۆ ئەگری

هەم هاوسەرو ئاگادارمی

تۆ هاوژینمی

خۆت ئەوینی

دڵم بۆتۆ نیشتیمان و تۆش شاژنی

هەم تاجێکی بۆ سەرسەرم و

هەم گۆچانێك بۆ پیریم

تۆ مێهنازی

لە نێوان هەشت ملیارمرۆڤ

تۆ لە خودا داوامی..



# نازە

چەندە خۆشە لەگەڵ نازە

دەمێك ئاشتی و دەمێك تۆران

نازە بڵێ دەرد منیش بە هێمنی بڵێم گیان

لە ژیان دا بژین بە دەرد و بە گیان

ئەو بڵێ دەرد من بڵێم گیان

ژیانێك بژین دوربێت لە دابڕان..



# نزا

له نێوان خۆم و خودا نزایەك

له ناخم دا هیوایەك و له ژیان دا خۆزگەیەك

له چاوانما ئەشك و حەسرەت

له ڕۆحیشم عیشقی پاكی

له ئاسمانیش مانگی جوانی

دەستم دامێن كچۆڵەی شار

بۆ ئەوەندە جوانی..؟



# غیرە

هێندە غیرەت لێ ئەکەم،ترسم لە هەموو کەس هەیە

ترسم هەیە بە چاوت بەن

هەم خۆرو مانگ هەم خەڵکیش

بڕیارە مانگ هەرخۆی جوان بێ

لە خۆی جوانتری خۆش ناوێ

ئازیزەکەم چاوەزارێك لە گەردن کە

با ڕازی دڵم ئارام بێ

کە تۆ بەم ڕادەیە جوان بی ترسم لە بوونی مانگ هەیە

دەترسم بە چاوت بەرن گشت کوڕو کچانی شاریش

دەترسم ئازارت بدات خۆری بەیانیانی شاریش

کە تۆ چاوت لە مانگ جوانتر

ڕوخساریشت وەکوو خۆربێ

بەژن و باڵاشت ڕێك و پێك

وەکوو داری سنەوبەربێ

خەڵکی چیان بینیوە،

کە لەمانە بچێ..؟



# ئەیسەلمێنم

ئەیسەلمێنم ئەبمە کەسێ

لە ژیانتدا وێنەی نەبێ

زمان لاڵ بم،

ئەگەر بە خراپ باست بکەم ڕۆژێ

ئەیسەلمێنم،« لێوم بە خراپ ناوت بێنێ بیسوتێنم»

گەرئەو دڵەم ویستی ئەزیەت دانتی هەبێ

لە سینەما دەری دێنم و لەبەرپێت دا دەیکەم بە ڕێ

ئەیسەلمێنم ئەبمە کەسێ

دڵخۆشیت بۆم پێویستی بێ

تۆ پێبکەنی دڵم شاد بێ و

بتکەم بە هاوسەرین و ڕێ

ئەیسەلمێنم ئەو دڵەی من بۆتۆ نەبێ

بۆ هیچ کەسێك

نەبێ بە ماڵ و جێ..



# دوعا

بیرمە دەستم خستە سەر دڵت،

دوعایەکم لە دڵت کرد

بێ ئەوەی پێی بزانی و هەستی پێ بکەی

خودا قبوڵی کرد،

بیرمە وتم خوایە بێجگە لە من کەسی نەوێ

بۆ هەرشوێن و جێیەك بچێ،

یادم لە دڵی دەرنەچێ

بە جۆرێك هۆگرم بێ و خۆشمی بوێ

لە خۆم بچێ

گەرگشت دونیاش ڕێگرمان بن،

بۆ چرکەیەکیش ڕۆشتن بۆ خەیاڵی نەچێ..



# ماچی یەکەم

ماچی یەکەم ئەو ماچەیە،
دڵەکان پەیوەست بە یەك دەکا
لەگەڵ پەیوەست بوون بە یەکتر،
سەدان بەڵێن دروستەکا
ئەو ماچەیەکە لێوەکان لەسەر یەکترلەرزۆك دەکا
هەناسەی عاشقان لەگەڵ یەك
خوێنەکانیش تێکەڵ بە یەك
چاواکانیش دیل بە دەست یەك
زمان لاڵ و وشەی بێ فیز
دڵ دەکات بە ماڵی عاشق
معشوقیش بە سەرۆك و ڕەئیس..



# بیرم دەکەیت..؟

بیرم دەکەیت..؟

وەك ئەو کاتەی لەگەڵما بوویت، سەیرم دەکەیت..؟

بیری جێژوانی کۆن و تازە دەکەیت

ڕۆژانێك داوای من لە خودا دەکەیت..؟

بیرم دەکەیت ، بۆم دەگریت و نزا دەکەیت؟!

هەروەك جاران بە قژە درێژەکەت ناز دەکەیت..؟

بەیانیان لەناو جێگاکەت بە خەیاڵ یادم دەکەیت..؟

بیرم دەکەیت

شەوانە پێش خەو لە دڵتەوە شەوشادم لێدەکەیت

هەروەك جاران بە لەنجە و لارڕێدەکەیت؟!

سەرپۆشەکەت لەسەردەکەی و بە قسەم دەکەیت..؟

ئێستاش بەنازەوە لەبەرباران سەما دەکەیت..؟

بیرم دەکەیت

خۆت لە چاوی عەسود و بەدکاران لادەدەیت

هەروەك وتم چاوەزارێك لە مل دەکەیت..؟

بیرم دەکەیت بۆ گەڕانەوەت،

بەڵێنێك بە خۆت و بە منیش دەدەیت..؟

# ملپێچە سورەکە

ملپێچێکت کرد بە دیاری،بۆ یادگاری
بە گوێما چرپاندت هەزاران وشەی دڵداری
کە خۆت هەبووی، چاوم وێڵ کرد بە دوای جوانیت
کە خۆت نەبووی، چاوم لە گشت دونیا کوێرکرد
زمانم لاڵ بوو،بۆ ناوهێنانی گشت کەسێك
دەستەکانم کرد بە خامە و دەیان شیعرم بۆت پەخشان کرد
ئێستا لەگەڵ یەکەم شنەبای زستان،
ملپێچەکەت خۆی لە ملما دە ئاڵێنێ
هەزاران یادگاری جوان بەدوای خۆیدا دێنێ
چەندان بەڵێنی جوان جوان کە بە منت داوە،
هیواو سۆزێك بۆ ئەم دڵە سەد جارشکێندراوەم دێنێت..



# خوشکەکەم

بۆ خوشکی جوانم پشت و پەنای ژیانم

تۆی ناسکترلە گوڵ تۆی شیرین ترلە هەنگوین

تۆی نهێنی پارێزی خەمەکانم

دەسڕی بۆ فرمێسکی چاوەکانم

خوشکی جوانم بێ وەسفت ناکەم لە شیعرەکانم

تۆی خوێنبەرەکانی خوێنم

تۆی دڵ و ڕۆحم و هەردووك چاوم

تۆی شیرینترین و ئێسك سوکترین تابلۆی ژیانم

خوشکی جوانم، تۆ ئەو کەسەی لە دڵتەوە خۆشت دەوێم

منیش ئەو کەسەی،

داوای دڵم کەی بە ڕۆحمەوە بۆت ئامادەم

خۆشم دەوێیت خوشکی جوانم

هەردەم لە پشتتم،

تا ئەو ڕۆژەی لە ژیان ماوم..



# باران

باران دەبارێ و زەوی تەڕدەکا

ئاگری ناخم،بە تین تردەکا

مانگی چواردە،هەرلە خۆت دەکا

بمرێ ئەو کەسەی،تۆ لە من دەکا

خەیاڵەکانم،بۆ لای تۆم دەبا

شیعرەکانیشم،هەربانگت دەکا

ئەسرینی یارم،ئەشکی عەسرەتە

لەلای شاعیریش،

غەم بۆی سەروەتە..



# کوانێ عیشقی جارانت..؟

ئێستاش دوای ساڵانێك،
ئەڵقەکەتم لە دەست ماوە
ئەی تۆ بۆ نایکەیتە پەنجە و..؟
یادی منت بیرنەماوە،
کە ئەمبینی و نیگا ئەکەی،کوا وەڵامی نیگاکانم..؟
کوانێ وەفای ئیشقی جاران،ئەتوت بۆتۆ یان بۆ گڵم
سەردا ئەخەی شەرمەزاری،لێم ناپرسی کەوا چۆنم
ئێستا بێ تۆ تەنیا و بێ کەس،حاڵی دڵی خۆم ئەهۆنم
لە جێی لێوی سوری جاران،شەڕابی سورئەخۆمەوە
لە جێی دوو چاوی جوانی تۆ،
لەگەڵ مانگ ڕۆژدەکەمەوە
لەجێی باڵای ڕێك و جوانت،
سنەوبەرێك ئەکەم بە جێم
ملپێچەکەت بە کفنم و
بە مەستی سەردەنێمەوە..



# بەڵێنبێت

بەڵێن بێت گەربە تۆش نەگەم،
جوانترین یادگاری ژیانم بیت
کە تۆ عیشقی یەکەمم بویت،
با هەرخۆت کۆتا دانەش بیت
ئەو بەڵێنانەی پێت دابووم
لە خەیاڵم دەیهێنمە دی
ئەو ماڵەی هیوامان بۆی خواست،
لە دڵمدا خۆت شاژنی
لەسەری بکە تاجی ڕۆحم،
میرنیشینی هەشت وڵاتی
لەسەرسەرمە شوێن و پێگەت،
میهرەبان و هەم نازداری
لە چاویشم وەك بەهارێك،
ڕواوی گوڵی شەونمی
لەسەرلێوم وەك پێخەفێك،

دایدەپۆشم خونچەی کاڵی
لەبەردەمم بۆنی دەکەم، لە گوڵاڵەی قژی خاوی
هەزارشیعرو ئاوازی جوان، قوربانت بێت
ئەی میهنازی پڕلە جوانی..



# قەسەم بە خودا

تۆ دەزانی چەند پەیوەست بووی بە دڵمەوە..؟

هەرچیش بکەم ناتوانم لە بیرخۆمت بەرمەوە

قەسەم بەو خودایەی کە ئەیپەرستم "

ئەڵقەی تۆ نەبێ نایکەمە دەستم»

قەسەم بەو خودایەی کە هەردووکمان خۆشمان دەوێ

لای خودا پاکی،هەرسەردەکەوێ

قەسەم بە خودا نەخۆر،نە مانگ ،ئەستێرەم ناوێ

دوو چاوی گەشی تۆ،ئارامیم دەوێ

شەرمەندەی بارەگای خودا بم

گەربێ لە تۆ،لەگەڵ کچێکی تر پەیمان ببەستم..



# بەسە..!

نەوەك جاران هۆگری تۆم

نە شیعریشت بۆ ئەنوسم

نە هەبوونت ئەگرمە خۆم

نە خەمیشت بۆ ئەخۆم

تۆ بیابان بیت،منیش باران

نایەمەوە وەکوو جاران

ئیترنە خەمت بۆ ئەخۆم

نە خەمیشت ئەگرمە خۆم

دووربون لێت ئەکەم بە پێویستی

ئیتر دڵێك داوای تۆ بکا

لەناو سینەم دا ناژی..



# بێزارم

بێزارم لە گریانی هەورو یار

بێزارم لەو دڵۆپەی

کە دایکردە سەرکوڵمەی کچێکی هەژار

بێزارم لە خەمی دوری تۆ

وای لە قەدەر

ناگەم بە تۆ

بێزارم لە بێوەفایی ئەو دایکە بەرامبەرتۆ

ڕێگربوو لە عیشق و باشی تۆ

بەقسەی خۆی بۆ حاڵی دڵت پەرێشان بوو

بە قسەی خۆی لە خەمی تۆدا بوو

کەچی دڵڕەقیەکەی بۆتۆ

بەس ئازاربوو..



# عیشق

ئەگەر ڕۆژێ منت نەبینی

ئەوە بزانە من مردووم و گۆڕم ئەبینی

ئیتر کەسێ نییە چاوەڕوانت بێ

ئەوکاتە دڵت هەست ئەکات

چاوت پڕ گریان دەبێ

تازە سودی نییە

گریان و پەشیمانی

تازە نایەتەوە ئەو عیشقەی

بە دونیای تۆم دەزانی..



# کوڕێک

گەنجە جوان و باشەکەی جاران

خۆت بینیوە..؟

هیچ نەماوی وەکوو جاران

جوانێك هات و دیلی کردی

جێی هێشتیت و دڵی بردی

خەمی دووری و دابڕانی

سەرو ڕیشی سپی کردی

ئێستاش هەرخەمی بۆ ئەخۆی

کەچی وێرانی کردی

ڕۆژێك دادێ پێی ئەزانی،

بەڵام دادت نادات پەشیمانی

ئەوەی کە ڕۆشت نایەتەوە

دڵ کاتێك مرد

ناژیەتەوە..



# یادگاری

ئەمشەو یادگارییەکانی تۆ

بادەی خەمم پێ دەنۆشێ

ساقی دێت و دەستم ئەگرێ

بێ سەرەو شوێن ڕێم پێ ئەگرێ

ئەمباتەوە بۆ شوێنێ

یادی ئێمەی تێدا نەبێ

نەوەکا بەدەم خەمەکانم

مەرگ بێ و یەخەم پێ بگرێ

دێت و دەڕوا بێ سەرەنجام

بۆ کوێ بڕۆین شوێن پێی تۆیە

هەموو کوچێکی ئەم شارە

جێژوانی جارانی تۆیە

دەست دەخەمە هەرشوێنێکم

شوێنی ماچ و دەستی تۆیە

دەست دەخەمە سەر دڵم

ترپە و لێدانی بۆتۆیە

دڵم بۆتۆ نیشتیمانە و

عیشقیشم لەم نیشتیمانە

ئالآیەکە و بەس بۆتۆیە..



# پایزی جودایی

ئەو پایزەی خۆری ژینمان لێ ئاوابوو
ئەو پایزەی ژینمان تەواو پێی ویران بوو
ئەو پایزەی وادەی ماڵئاوایی نەبوو
کاتی خەم و پەژارە و مەینەت نەبوو
کاتی کۆچی خۆزگەکان و کاتی ڕاوی چۆلەکەکان
نەبوو، پێش هاتنی ئەم پایزە
ژینمان تەواو مۆعجیزە بوو نهێنی جێژوانەکانمان
تەنها لای نەمام و چۆلەکە و باڵندە بوو
ژیان ئەو کاتە جوان بوو کە هەناسەم تێکەڵ بە
هەناسە و گەرمی باوەشی پڕ وەفات بوو
وەرینی گەڵای پایزم بۆ چییە..؟
کە من خۆم خەزانی دەستی تۆ بم
دە تۆش پایزگوزەشت بکەم
کە من ئێستا پایزی خۆم وا لە کۆڵە..!
چ پێویستم بە پایزی تۆزو خۆڵە؟!

# تاڵێک قژت

تەمەن کورت و دابڕان زوو
تۆ ڕۆشتیت و تاڵێك قژت
بۆ سەبوریم لەلام نەبوو
با بڕوا ئەم ژیانە خۆشی بۆ من نەبوو
ئەوەی لە ژیان دەمویست
قسمەتی ئەم دڵەم نەبوو
ئەو ڕۆژەی هەواڵی مەرگم ئەبیستی
دەڵێی خودایە خەون بێت
دەزانی ئەوکەسە ڕۆیشت،
کە هەموو شتێکی بۆ دەکردی
ئەو کەسەی لە خودا کەمترو
لە خۆت زیاترخۆشی ویستی..



# هیچ مەترسە

هیچ مەترسە

هیچ مەترسە لە زمانی باوبۆران

هیچ مەترسە لە ئاگری بەتینی ڕۆژگار

هەتا ئێمە دوان بین

وەك دوو درەخت لە پاڵ یەك بین

هیچ مەترسە

سێبەریشمان لەگەڵ یەکە

هیچ مەترسە ئێمە دوانین هیچ بایەك نامان لەرزێنێ

هیچ مەترسە

گەر پاییزیش زەرد و هەڵوەریوی کردین

هیچ مەترسە

ئێمە ڕەگمان تێکەڵ یەکە..



ئیسماعیل یاسین

# سووچمان نەبوو

دوو مرۆڤی پاك و بێ سووچ
زیانی هیچ كەسێكمان نەبوو
لە فەرهەنگی ئیشقی ئێمە
دێرێك جودایی تیا نەبوو
وشەیەك بە ناوی خۆزگە
لەلای ئێمە مانای نەبوو
لە چیرۆكی ئیشقی ئێمە
هیچ ئازارێك بوونی نەبوو
بەڵام ئەمانە گشتان بوون بە سەراب
گشتیان بوون بە مۆتەكەی خەونی شەوان
بە تاوانی خۆشەویستی  لە ئامێزی یەك لابراین
چاومان فێری گریان و
بە وشەی خۆزگە فێركراین
بە ئازارو غەمی دونیا
تا ئەو ڕۆژەی بە یەك دەگەین
سپێردراین..

# پێداگری عیشقی یەکەم

ئێمە هەردووکمان گرفتاری یەك دەردین
ئێمە بە یەکەوە فێری خۆشەویستی بووین
لەگەڵ یەکتر گرفتاری عیشقێکی پاك بووین
گوڵم ئێستاش وەك جاران ماوم
لەسەر عیشقت پێداگرم،
بۆ چرکەیەکیش لە خۆم نەگۆڕاوم
هەناسەم وا هەست مەکە
من لە عیشقت سارد ببمەوە
من بە تیری نیگای چاوت پێکرام
بۆ عیشقێکی تر ناژیەمەوە
من لە زیندانی دڵت بەند بووم
تازە ئازاد نابمەوە
من بۆ ڕێگەی عیشقێکی پاك هەنگاوم نا
تازە قەت ناگەڕێمەوە..



# بێ ئومێد مەبن

بێ ئومێد مەبن لە سۆزی خودا

بێ ئومێد مەبن لە پەیمانی خودا

وەك چۆن خودا پەیمانی داوە

گشت پاکەکان بە یەك بگەیەنێ

وەك چۆن خودا بۆ گشت کەسێ

کەسێکی لە خۆی بۆ دروست کردووە

گەر گشت دونیا دوژمنتان بێ

خودا لە پشتانە و هەربەیەکتان دەگەیەنێ

بێ ئومێد مەبن، دوای چەندین شەو پاڕانەوە

دوای تەمەنێك لە بێ کەسی

دوای خەم و گریان و شەو نەخەوتن

شەوێکی ڕوناك چاوەڕێتانە،کە ئەمجارە لە خۆشی ناخەون

گریانێك لە ڕێگەتانە،کە ئەمجارە بۆ دڵخۆشییە

کەسێك بۆت دەبێ،کە خەونی هەموو دونیات بووە

ئەمە قسەی من نییە،

پەیمانی خودایە لە پاش گشت خەمێك خۆشییەك دێ

بێ ئومێد مەبن چاوەڕێ بن..

# شەوی یەڵدا

شەوی یەڵدا تۆی درێژترین شەوی ساڵی من
تۆی خەم و ئێش و برینی من
لە یارم دوورم و تەنیایی تەنگی پێ هەڵچنیوم
ئەم شەوە درێژانە بێ تۆ نابڕێتەوە
خەمی دووریمەوە و دڵ و ڕۆحم ناحەسێتەوە
ئێستا وەك ئەوسا
باوەشی گەرمت بەفری دڵم ناتوێنێتەوە
دڵ؟، چ دڵێك؟
دڵم وەك بەردە بێ تۆ
گیانم پڕ دەردە بێ تۆ
ئەمشەو دوا شەوی پایزە
گەڵای داری شیعرم زەرد و هەڵوەریوە بێ تۆ..



# گەر من مردم تۆ چی دەکەی..؟

تۆ ئارام بەخشی دڵ و ڕۆحمی
بۆ گەرمی گیانت وەك و مۆمێك دەتوێمەوە
دەبم بە هەڵم،دەبم بە باران
دیسان بۆت دەبارێمەوە
لێت پرسیم دڵم ئەگەر من مردم تۆ چیدەکەیت
منیش وتم لە خەیاڵ و بیرم تۆ هەر دەمێنیی
با هەموو خەڵك بڵێن شێتە
بەڵام لەلای من تۆ هەر نەمردووی
بە خەیاڵیش هەموو کاتێك هەر لەگەڵمی
من ڕازیم لە دونیا تەنیا بمێنمەوە
بەڵام خەیاڵی تۆ لە لام نەڕوێتەوە
یادگارییەکانت بۆ من مایەی ژینە
باوەشی خەیاڵت هەردەم بۆم مایەی نەبوونی شینە
بە خەیاڵ تۆم قەت بیرناچێتەوە
ڕۆژی سەد جار هەر ناوی تۆ دەڵێمەوە
دەست بە دوعا و پاڕانەوە

داوای تۆ لە خودام دەکەمەوە

گەرسەد جاریش بمرم و بژیەمەوە هەرئاشقی تۆ دەبمەوە

گەرلەو دونیاش لێم بپرسن هەرداوای تۆ دەکەمەوە

ئیترمەڵێ گەرمن مردم تۆ چی دەکەیت

هەموو ڕۆژێك مردنێکە و

بۆ ئەشکەنجە دەژیەمەوە..



# ئەو ڕۆژانەت بیرە..؟

ئەو ڕۆژانەت بیرە،کە تۆم تیا بینی

بوون بە بەشێك لە ئەقڵ و هۆش و بیر

ئێستاش بیرمە ئەو ئێوارەی

کە تۆم بینی بۆ یەکەم جار

بیرمە،کە چۆن سەیرمت دەکرد

بزەت بۆ دەکردم جارجار

بیرمە یەکەم دەست گرتن

بیرمە کە چەند شەرمت دەکرد

بیرمە،گەرمی دەستەکانت

بیرمە ماچی لێوەکانت

بیرمە کە چەند شیرین بوون

هەموو قسە و وشەکانت

ئێستاش هەمووی وا لەبیرمە

نیگاکان و پیاسەکانت

قەت بیرم ناچێت ئەو ڕۆژانە،کە چەندە خۆش بوون

تۆش قەت نەڵێی بێوەفا بووم،

هەموو شتەکانت بێ هۆ بوون..!



# نەخشەی گەڕانەوەت

ئەم شەو بە دەستی لەرزۆکمەوە

بە چاوی پڕ فرمێسکمەوە،

نەخشەی گەڕانەوەت دەکێشم

نازانم ئەم دوورییەت بە چی بپێوم،

نازانم ئاهی حەسرەتت بەچی نەکێشم

وادەزانم دەمرم و کۆتایی نایە

وادەزانم دەسوتێم و ئەو نایەت

من دەسوتێم بە تینی خۆرت،

تۆش تینوترلە برژانگی مانگت

من پێشبڕکێ لەگەڵ مەرگ و بێ سەبریم،

تۆش بێ نیگای نەخشی گوڵی لەسەر دڵم

نە بای ساردی خۆت لە جەستەم بئاڵێنی

نە فرمێسکی لە چاوانما سەر دامێنی

نە خۆرهەتاو جارجارە گەرمم کەیتەوە،

نە بارانی بە خۆتم شاد کەیتەوە

تۆ مانگیت بە هەوری ڕەشەوە

تۆ گوڵێکیت،

بەڵام لە پایزەوە..



# شیعرەکانم

گلەیی مەکەن لە شیعرەکانم
کە گشتی خۆشەویستییە
مەڵێن خاك و نیشتیمان، لەلای تۆ هیچ بونی نییە
هەرشاعیرە و شیعرەکانی
مەبەستێکی واقعییە ، خۆشەویستی بۆ من
نیشتیمان و ئازادییە
دڵم بۆ کچێك، نیشتیمان و عیشقیشم
بۆی ئازادییە..



ئیسماعیل یاسین

# نامەیەک لە پایزەوە



سڵاو ئەی هەناسەی من

سڵاو ئەی هەموو ئاواتی من

خەفەت مەخۆ لەم پایزە هەڵوەریوە

خەفەت مەخۆ لەم بەهارە گوڵ نەدیوە

ڕۆژێك دادێت لەگەڵ بەهار دەژیەینەوە

بۆ نێو پیاسەی ناو گوڵ زاران،دەگەڕێینەوە

ڕۆژێك دادێ بە یەك دەگەین و بەیەکەوە گوڵ دەچنینوو

پێشکەش بە یەکتری دەکەینەوە،

سەبرت هەبێت خودا مرادی دوو دڵی پاك

هەربە یەکتر دەگەیەنێت

خودا دڵی بەندەکانی قەت ناتۆرێنێ.

دوعایەك دەکەم بۆ گشت ئاشقەکان

دوعا دەکەم هەرچی دوو دڵی پاك و ڕاستگۆ هەیە،

خودا لە پایزی داهاتوو گشتیان بەیەك بگەیەنێ

وشەیەك بەناوی قسمەت نەبوو

لەسەرزاری هیچ کەس نەمێنێ..

# کێم بۆتۆ..؟

کێم بۆتۆ

هۆ ئەو کچەی لەلام جوانی

خۆشم دەوێیت چونکە لەسەر پەیمان ماوی

هەرئەو لاوەم کەوا دەتوت تۆ دونیامی

هەرئەو کوڕەم بۆ گەشتن پێم

دەتوت لە خوا داوامی

کێم بۆتۆ

هەرئەو لاوەی کەوا جاران خۆشت دەویست،

هەرئەو کچەی بۆ گەشت پێم،

چەندان خەمی بە کۆڵت چێشت

هەرئەو کوڕەم داوام کردبا بۆم ئەمردی

تۆ داوات کرد،

هەموو تەمەنم پێشکەش کردی

هۆ ئەو کچەی خەمی دوریم زۆرئازاری داوی

یادەکانم چەندان شەو فرمێسکی پاکی

پێ ڕژاندووی، هۆ کچی جوان
تۆ جیاوازی، لەگەڵ هەموان
ئەو بەڵێنەی لێم وەرگرتی بیرت ماوە
ئەو دڵە پاکەت،جێگەیەکی بۆ خیانەت نەماوە
هۆ کچی جوان
بیرت نەچێت من کێم بۆتۆ
بەوافا بووم ئەو بەڵێنانەم بردە سەر،
کە دام بە تۆ..



# خۆش

ئەبێت چەندە خۆش بێت ڕۆژێ
ببین بە هاوسەرین و ڕێ،
لە ئاهەنگێك لە تەنیشت یەك
پێمان بڵێن پیرۆزتان بێ
ئیتر بوون بە هاوسەری یەك
بوون بە هاوسەرینی یەك
بوون بە موڵك و مەلیكی یەك
بوون بە عەلاڵ و پشتی یەك،
پیرۆزتان بێ
ژیانێکی خۆش بژین،
لەگەڵ یەك..



# ناتوانم لەبیرت کەم

خۆ ئەتوانم من لەمەو دوا ئیتر شیعرت بۆ نەنوسم

بەس ناتوانم لەبیرت کەم

بێوەفاییت بە گەردنم

«خۆ ئەتوانم من نەیکێشم نازەکانت بە پێنوسم»

بەس چیبکەم لە دڵەی شێت تۆ هەرچەندە دڵ بشکێنی

من جوانترت بۆ دەهێنم

زۆر دڵنیام تۆ دێیتەوە

دڵنەوایم ئەدەیتەوە

تۆ دەزانی من بەیانیان یادی تۆیە هەموو ڕۆژێك دەمگریەنێ

تۆ دەزانی خەمی دوریت هەموو شەوێك

فرمێسك لە چاوما دەڕژێنێ

بەز دڵنیام تۆ دێیتەوە

بۆ جێژوانی ئێستا و جاران

هەرچی خەمی لە کۆڵمانە

دادەڕمێت لەبەرباران..



# تێکەڵ بوون

جودا بونی ئەمڕۆ و سبەی

یان ماچ و مژانی دوێنێ

چیت پێ بڵێم بێ لە شیعر..؟

حاڵی دڵی من بنوێنێ،

یادی ڕۆژانی ڕا بردوو

یان یادی وەفای بە با چوو

یان ڕۆژانی ژوانی جاران

یان باغ و سێبەری سێوان

یان سێدارەی لێوی گوڵ و

یان شەرمی جارانی یاران

یان ئەو ڕۆژەی کە لە جێژوان

لێوەکانت هەڵەلەرزین شڵەژاو بوون لە شەرمان

یان هەناسەی تێکەڵاو و

یانیش شیلەی گوڵی هێرۆ

خۆزگە دونیا دەگەڕاوە بۆ یەکەم جێژوانی جاران

ئێستا دوریت شکاندومی،

تەڕی کردوم، بەبێ باران..!



# گوڵ

هۆ ئەو گوڵەی دوێنێ هەبووی

ئەمڕۆش ونی، دوێنێ هەبووی

ئەمڕۆش پرسیارم لە گوڵەکان لێ ئەکردی

بە لای هەرگوڵێ دەڕۆشتم ،

بە بۆنی تۆی پەیوەست کردم

نەم ئەزانی نە تۆ گوڵی، نە گوڵ بۆنی لێ وەرگرتووی

گوڵەکان چەند لە تۆ دەچن لە ناسکی و بۆن و ڕوخسار

بەڵام هێشتان زۆریان ماوە،

بگەنەوە بە جوانە کیژۆڵەکەی شار..



# خودا

غەیبەت کردن نەخۆشییە و یادی خودا دەرمانە

هەرکەس لە خودا بترسێت ، پێگەکەی دورلە داڕمانە

دوحا بکەن بۆ سەرکەوتن ، گیرابونیش بە کردارە

هەرکەس خودای خۆش بوێت

ئەوسا دەزانێت، چەند میهرەبانە..



ئیسماعیل یاسین

# میهرەبانی

کەسێکم خۆش دەوێت لە وێنەی نایە

هەرچەندە تاوان بکەم،

میهرەبانە و لێبوردەیی بێ کۆتاییە

ئاگای لە دڵمە و بۆ دەردەکانم دەوایە

ئارام بەخشەو دڵم پەیوەستی یەك تکایە، ئەو خودایە.!

«بۆ داواکانم میهرەبانە و بۆ ڕەتکردنەوەی دڵی نایە»

هەر دەرگایەکیشم لێ داخات

دڵنیام چەندان دەرگای تری بۆم وەڵایە..



# فێرگەی عیشق

پێیان سەیرە لە ئاستی من وەفاداری

پێیان سەیرە کە لەبەرمن،

لە ڕوی گشتیان دا وەستاوی

پێیان سەیرە دوای ئەمانە

هێشتان لەسەر عیشقم ماوی،

بۆ چرکەیەکیش لە خۆت نەگۆڕاوی

پێیان سەیرە بە ئەشکەنجەش،

ناوی منیان لەسەرزمان لانەداوی

بە شکن لە پاك و بێگەردی تۆ

وادەزانن وەك ئەوانی

نازانن لە فێرگەی عیشقم،

دەرس دراوی

نازانن هەرخۆم فێری عیشقم کردی و

وانەی وەفاداریم پێ داوی..



# دڵبەر

تاڵێك موی قژت بە هەموو دونیا نادەم
دڵۆپێك فرمێسكی چاوت
لە هیچ كەس قبوڵ ناكەم
چاوە سەوزو جوانەكانت لەگەڵ بەهار ناگۆڕمەوە
لەگەڵ پێكەنینە شادی بەخشەكەت دەژیەمەوە
باڵا كوڵەكەت بە سادان باڵا بەرز ناگۆڕمەوە
جوانە ئافرەت بەڵای كوڵ بێت
لەنێ و تۆدا جێگەی هەبێت
پڕنازو مەكری
جوان وەك گوڵی
شاجوانێكی هەروەك مانگی
بەهەشتێكی لە نێ و دڵی
لە چاوانما هەروەك حۆری
سێبەری بۆم ناڵێم خۆری
تۆ مانگی بۆم ڕوناكی دێنی
لەگەڵ خۆتدا بەرەكەت دێنی

لەگەڵ خۆت دا گەنجی دێنی
دڵبەری دڵمت بردووە
بە نیگای چاوت منت دیل کردووە
گشت کچی دونیام لەبەرچاو کەوتووە
لەبەرچاومی وەفاداری
لەگەڵ ئەوەش دا،
جوانترین کچی شاری..



# تێگەیشتووم

تێگەیشتووم هەموو خۆشەویستییەک عیشق نییە

هەموو باشییەک ناوی دایک نییە

پیاوی هەموو ماڵێک باوک نییە

هەموو جیابونەوەیەک قەدەر نییە

ژیان هەموو کات خۆشی نییە، هەموو تاڵییەکیش خراپ نییە

زۆرجار شیرینی باش نییە، هەموو کاتێک قەدەر بە ئازار نییە

بە یەک گەیشتنیش خەیاڵی شاعیرەکان نییە،گەر وەفا هەبێت

قەدەر هیچ تاوانی نییە..



# مەبەست

خۆشەویستی من بۆتۆ

بەرهەمی ڕاستگۆییە

پەیوەست بونم پێت

بەرهەمی وەفادارییە

عیشقی ئێمە

دەمێك شیرین و دەمێك تاڵییە

بە وێنەی نەورۆزی کوردەواری

پڕلە گوڵ و شادییە، هێندێك جاریش

بە وێنەی لافاوی تسۆنامییە

شیعرەکانیشم دڵدارییە

چونکە بە یادی تۆ، دونیای لا خاڵییە

وەرە ئەو تەمەنەی ماومە نازت بکێشم

وەرە باغێك بە،

من باخەوانم لە پێشتم

گوڵێکی بە نازپەروەردەت دەکەم

هەرخۆم ئاگام لێت بێ و

پایزانیش یادت بکەم..



# تۆ هەرجوانی

لە هەرسوچێکی ئەم دونیایە سەیرت دەکەم
تۆ هەرجوانی
بەبێ تۆ بم،
کوانێ شادی..؟
لەلای من مانای وەفاداری
لە چاوانما هەروەك گوڵی
تەنها تۆ مرادی دڵی
لەگەڵ تۆ بوون مانای ژیانە،
هەست پێدەکەی ژیان بەبێ تۆ چەند وێرانە..؟
بەبێ یەك بین وردو خاشین
بەبێ یەك بین زۆرناسازین
لەگەڵ یەکتروەفا دارین
هەست پێدەکەی لەگەڵ یەکترچەندە جوانین..؟
دوو عاشقی جەنگاوەرین
لەگەڵ یەکترزۆریاوەرین

بەبێ یەك بین بەبێ خۆرین

هەست پێدەکەی لەگەڵ یەکتر

هەروەك مانگ و خۆرین..؟

بەبێ تۆ بم ژین ویرانە

لەگەڵ تۆ دا ژیان زۆرجوانە..



# ناو

ئەگەرڕۆژێك، ناوی منت کەوتە بەرگوێ
ئەگەرڕۆژێك، زمانت لە ناوهێنانم هاتە بەرژێ
ئەوکات دڵت دەڵێ
تەنیا ئەو بەڕاستی منی ویست
ئەقڵت دەڵێ تەنیا ئەو تێگەیشت
چاوەکانت دەڵێن تەنیا منی خۆش ویست
دەستەکانت شایەدی دەدەن،
تەنیا دەستتی ویست
خۆشت بەهانە دەگری و دەڵێی،
قەدەرنەیویست..



# سەریساڵ

ئەمشەو سەری ساڵە

لەم ساڵەی کە ڕۆشت،تۆ باشترین کەسم بوویت

لە خۆشی و ناخۆشی،هەرلەگەڵم بوویت

چرای شەوە تاریکەکان و ئارامکەرەوی زامەکانم بوویت

خۆشەویستی گشت دونیام و مانگی ئاسمانم بوویت

هەرخۆت ئەستێرە و دەریایەك لە شادی بوویت

کۆرپەی دڵم و جوانترین کچی شاربوویت

لە نزاکانم هەرتۆ داوام بوویت

لە ڕۆژەکانم،هەرخۆت نەجیب بوویت

لە شەوەکانم،هەرخۆت تەبیب بوویت

هەرخۆت سەرەتا و کۆتایم بوویت

لە دڵەی شێتم عیشق و ئەوین بوویت

لە چاوانما ڕوناکی بوویت

لە ژیانما ماناداربوویت

سوپاس بۆتۆ،

کە لەگەڵم بوویت..



# گیتار ژەنێك

گەر ئەمجارە گەڕایتەوە، لەگەڵ بەهار سەر دەرییێنە
لەگەڵ گەڕانەوەت، سەوزایی بۆ باخچەکان بێنە
تۆ ئەو گوڵەی بە هاتنت، پایز دەبێ بە گوڵ زار
تۆ ئەو دکتۆرەی بە هاتنت، دەردی دڵم دەکەی تیمار
تۆ پەپولەی ئارامی، ئاشق بە دەنگی گیتار
منیش هەزاران ئاوازت بۆ دەژەنم، وەك شێتێکی ژەنیار
من ئەولاوەی لەگەڵ پایز، خۆزگەکانم گشتیان وەری
تۆ ئەو کچەی بۆ هاتنەوەت، ڕۆژو مانگ و ساڵ ئەژمێری
من ئەو لاوەی بۆ دیدارێك، هەردەم لەبەر ماڵەکەتم
بۆ یەك نیگای نێو چاوانت، شەوگەڕی بەر مەدرەسەتم،
تۆ ئەو کەسەی بی پرسی خۆم، چویتە دڵم
تۆ ئەو کەسەی بێ پرسی خۆم، دێیتە بیر و هۆش و خەوم
بگەڕێوە هەر وەك باران،نم نم وەرە
بگەڕێوە،عەسرەتی دوری لە دڵ دەرکە

بگەڕێوە فرمێسکی چاوی ئەم عاشقە لە بن بەرە
بگەڕێوە لەم بەهارە،
بە هاتنەوەت گوڵ لە دڵم بچنەوە
لە ژێر سێبەری نەمامێك
بە چریکەی گۆرانیت و بە ئاوازی گیتارم
خۆشی بۆ ژیان بگەڕێنینەوە..



# کچێک

کچێک نییە لەم ڕۆژگارە،دڵی خۆش بێ
خەمی دوری و عیشقی کوڕێک
ژیانی داگیر نەکردبێ
کچێک نییە،دڵ پاکانە دڵی نەشکێ
لە باشی خۆی وەفادار بێ
کەچی لاوێک بێبەزەیی دەیڕوخێنێ
کچۆڵەی باشی خاوەن هەزاران جوانی
تۆ ئادەمیزادێکی،
خودا بە میهرەبانی ناوی هێناوی
تۆ ناز بکە و قژەکانت شانە بکە
هەرچی خەم هەیە،لە ژیانتی دەرکە
قسمەتی گشتمان،لە دەستی خوایە
گەر ئەو هی تۆ بێ،خەم بێ مانایە
دڵی شکاندی و هۆگری کردی
چی بچێنێت هەر ئەوەی لەسەر ڕێگایە
دونیا چەرخ و فەلەکە و ڕۆژیان ڕۆژی لە دوایە..



# دەکرێ..؟

دەکرێ لەگەڵ باران بێیت و
نەرم نەرم خۆت لە جەستەم بئاڵێنی؟!
دەکرێ لەگەڵ بەفر بێیت و
لەسەرلێوم سەردامێنی؟!
دەکرێ وەك و بەهار بێیت و
دڵم سەوزو جوانتر بکەی؟!
یاخود وەك و پایز بێیت و خەمی ژینم بە با بکەی؟!
یانیش لەگەڵ هاوین بێیت و
مانای دابڕان لە ژین دا ونکەی..



# ئیترمن لێرە دەوەستم

ئیترمن لێرە ئەوەستم،

ناکرێ هەست بکەی کە ئەتپەرستم

ناکرێ هەست بکەی،مرۆڤێکی ڕەق و بێ هەستم

تۆ داوای بکەی،بەرەو پیلی مەرگیش ئەچم

بەڵام ئیترلێرەدا ئەوەستم..!

من گیرۆدەی دڵی خۆمم و

تۆش جەلادی ئەشك و هەستم..!



# ئیتر بیڕارت نەکەم..؟

دەتەوێ بیڕارت نەکەم و هەرناویشم نەبیستی
دەستبەرداری کچەکەت بم،
پێی نەڵێم خۆشم ویستی..؟
وەفاداری ساڵانێك بسوتێنم
چونکە دڵت ویستی..؟
بەڵام داخێك بێ لە دڵت و
قەت ئەم پەیامە لە من نابیستی..!



# دوعای خۆشبەختیت بۆ ئەکەم

دوعای خۆشبەختیت بۆ ئەکەم،

ژیانت پڕ بێت لە جوانی

قەت ناڵێم بێ وەفا بووی،

کەسێکی تر بووە هۆی جودایی

لەگەڵ من بی یان کەسێ تر

قەت نەیچێژی پەشیمانی

ئەو تەمەنەی کە ماومە

بەڕێی ئەکەم بە چاوەڕوانی

ئێستاش بێیت یانیش درەنگ

هەر مێهنازەکەی جارانی..



# تۆ هی منی

بیرمە دەتوت تۆ هی منی و منیش هی تۆم

ئێستا تۆ لە خۆشی  و سەفا و  من خەمەکانی تۆش ئەخۆم

تۆ ڕۆشتیت و دڵمیشت برد

من شایستە و هێند خراپ بووم..؟

پێش ئەوەی بێیتە ژیانم

هێند بێ کەس بووم..؟

لێم ناپرسی هەستم چۆنە

تۆ پێت وایە هێندە مەست بووم..؟

بیرمە دەتوت تۆ هی منی و منیش هی تۆم..!

ئێستا تۆ هەروەك جاران و منیش بێ تۆم..



# باوەڕم وایە

باوەڕم وایە بۆیە مەستم و گیرۆدەی دەستتم

بۆیە هەموو شەو،تەنیا و بێ کەسم

چونکە دڵی،من ئاوێنەی دڵتە

هەڵبەستەکانم،پەیام بۆ دڵتە

ئاواتی دڵم،تەنها هەبونتە

کە تۆ یادم کەیت،دڵم هەستەکا

یەکسەرپەست ئەبێ و

بیری تۆ دەکا..



# چی دەبوو

چی دەبوو گەر دوریمان بە کۆتا بهاتایە..؟
تا بۆ هەمیشە دەستی هەر لە دەستم بوایە
بۆ هەمیشە هەستم بە،گەرمی دەستەکانی بکردایە
چی دەبوو کە هەرویستم،ماچی کولمەکانیم بکردایە
هەموو بەیانییەك لەگەڵ دەنگی چاوەکانم هەڵهێنایە
لە خۆشی ژیانم هاوبەشم بوایە
لە ناخۆشییەکانیش هەر لە پشتم بوایە
ئیتر لە خودا،
من هەرئەوەندەم داوایە..



# ئاخۆ هەمبێ..؟

ئاخۆ هەمبێ سێ چوار دێڕێك،
وەسفی جوانی تۆی کردبێ..؟
لە شیعرێك دا ئەم شاعیرە،
مافی خۆشویستنتی دابێ
وەفاداری و باشیەکەتی،
لە دڵی خۆی هەڵگرتبێ
دەستی ملپێچی ڕووی گوڵ و
چاوی دیلی دەستی مانگ بێ
پەیامی دڵی بەس بۆتۆ و
هیوا و خۆزگەشی لای تۆ بێ..



# مەستم

عاشق نەبووم،تۆ وات لێ کردم
مەست نەبووم،تۆ مەستت کردم
لە چاوانی خۆت،دیلت کردم
بە ماچی دەمت،تۆ فێرت کردم
بە وەفاداریت،سەرسامت کردم
بە جودایشت،وێرانت کردم
ئێستا لە دوریت،هەرخەم پیشەمە
دۆستی مەیخانەم،ساقی هاوڕێمە
ئێستا لە دوریت،هەر ڕەش ئەپۆشم
خودا پەرستم و بە شەڕاب مەستم
وامەزانە کە مەستم،ئەتپەرستم
مرۆڤێکی پڕهەستم..!
بەڵام من جیرۆدەی دڵی خۆمم و
تۆش جەلادی ئەشك و هەستم..



# ئەفسوس

ئەفسوس ئێمە لەم پایزە
خۆزگەکانمان بە دەریا چوو
ئەفسوس ئێمە لەم گەنجییە
ژینمان تێکەڵ بە نەهات بوو
ئێستاکانەش گەڕبێیتەوە
وەکوو جاران لە ئەویندا، ئەتوێینەوە
باوەڕبکە ئەو خەمانەی چەشتومانە
گشتمان لەبیر دەچێتەوە
گەڕبێیتەوە لەگەڵ خۆت دا
بەهاری دڵ دەڕوێتەوە
تۆ کەسێکی بەڵام بۆ من
جێی هەموو کەس دەگریتەوە
ئەو دڵەی من لای تۆ نەبێ
لای هیچ کەس ناحەسێتەوە
گەڕبێیتەوە لە جێگەی دڵ
ڕۆحمت پێشکەش دەکەمەوە..

# قەدەر

هەناسەی من

لەبیریکە ئەو ڕۆژانەی

قەدەرپێی داین خەم و مەینەت

ئێستاکانە لەلای یەکین

دوورە لێمان ئەشك و حەسرەت

ئێستاکانە خۆری خۆشی لەسەرمانە

ئەوەی پێمان ناحەزبوو

ڕۆژی ڕەشی بۆ میوانە،

تۆ بڕوانە چاوانی من

ساڵانێك ئەشكی بۆت ڕشتووە

بۆ خەڵاتی گەیشتن پێت

تەمەنێك شەڕی بۆت کردووە

لە باغی خۆشەویستی

نەمامی وەفای بۆت چاندووە

ئێستاکانە ئەم نەمامە بەری گرتووە،

بەرەکەشی قەدەرێك بوو

کە ئێمەی بە یەك شاد کردووە..



ئیسماعیل یاسین

# دەنگت

ئەمڕۆ بە زەنگت،بە ئارامی دەنگت

بە سەلامی بێ سەنگت، بە ئاهی مەنگم

حەسانەوە وەزن و سەنگم

دڵەی شێتم سەفەردەکا، لەم هەوارە سەردەرەکا

بەڕێ دەکەوم بۆ مەرگم

لە ژیان زۆرگۆڕاوە ڕەنگ و دەنگم

بۆ وادەی ماڵئاوایی عیشقم

بۆ ماڵی گۆڕهەنگاو ئەنێم

دوکتۆرتوخوا چارم مەکە، بۆ ئەم ژیانە تاڵە دەرم مەکە

بەشکم نایەمە دەرێ، جارێکی ترچاوم پێیان ناکەوێ

ئەوەی بوو بە سەبەبی مەرگم

ئەوەی بووە جەلادی ئەشکم

ئەوەی جەرگی پەڕپەڕکردم

ئەوەی تەواوی وجودی وەك شەق شەقە لێکردم

کە دەبینێت کۆچ و مەرگم

ئینجا دەڵێت ئاخ چەند بێ سەنگم..

٥

# کچەکانی کۆمەڵ بەگا

هەناسەی من
خەفەت مەخۆ لەم زەمەنەی
خۆزگەکانمان گشتیان وەری
خەفەت مەخۆ کە لەدوای تۆ
هیچ خۆشییەکم لە خۆم نەدی
خەفەت مەخۆ لە کۆمەڵ بەگای
کە فێرن بە کوشتنی مێ
خەفەت مەخۆ کە خۆزگەی کچ
نابێتە خەم بۆ ژیانی هیچ کەسێ
خۆشەویستی کچ بۆ کوڕێك
عەیبە و دەڵێن سنور دەبەزێ
تاوانی تۆ بەس کچ بوونە
کچ بوون لە کۆمەڵ بەگا
فەنابوونە..



# لێکیان کردین





ئەمشەو خۆم و جگەرەکەم..!
جگەرەکەم خەفەت مەخۆ
ئەم شەو هەرخۆم و خۆتین
»موشتەری وەك من بۆتۆ کەمن
« زۆریەیان شاد و بە کەیف و بێ خەمن
جگەرە حەرامە بۆ دڵ شاد و بێ خەمان..!
دڵی بێ خەم بۆچی بیگرێ جگەرە..؟
جگەرە بۆ دڵ ساخ و بێ خەم نییە
ئەم جگەرە تاڵ و پڕ دەردە
لێی حەرامە ئەو کەسەی بێ خەمە
ئەو کەسەی نەیچێشتووە دەردی دابڕان
ئەو کەسەی نەیدیوە ئێش و برین و ژان
ئەو کەسەی نەپێکراوە بە تیری زوڵمی زەمان
دڵی نەشکێندرا لە ژێر باری ستەم..!
ئەو دایکەی
هەستی بە زۆرداری نەکرد..؟

ویژدانی دایکانە بریندار نەکرد..؟
ئەی ئەو کەسەی دوژمن لە ماڵی دەرکرا..!
ئەو کەسەی نەیهاڕی بەرتاشی زەمان
ئەو کەسەی زیڕەی نەگەییە ئاسمان
ئەو کەسەی دووری عەزیزانی نەدی
تیرو تانەی بێ تەمیزانی نەدی
لێکیان کردین..!
لێکیان کردین دڵی دوو ئاشقیان شکاند
ئای لە ڕەقی ئەو دڵەی بتوانێ دڵی کۆرپەکەی بشکێنێت
ئای لەو عەسرەتەی فرمێسك لە چاوی ئاشقان دەڕژێنێ
ئای لەو ژیانەی بەرامبەرئاشقان بێ وەفایە
مردن لەکوێی..؟
بۆ بژیم..؟
بۆ بمێنم کە دڵی ئاشقم ڕەنجاوە
بۆ بمێنم کە ئەقڵی دوو ئاشق لەم ڕۆژەدا تاساوە
بۆ..؟
خودایە بۆ خۆتم ببەوە
خوایە مردنێك چەند خۆشترە
لە شکانی دڵی دوو ئاشق،

که وەك بولبولی ناو قەفەز بە حەسرەتی یەکن
خودایە چۆن دڵی دایکێك دەتوانێ ئاوا ڕەق بێت؟!
خودایە شایەت بە دایکێك
قاتیلی کچەکەی خۆی و ئەو کوڕەیە کە خۆشی دەوێت
خودایە لێکیان کردین..!
خودایە تەنیاین..!
خودایە پەناگەمان بەس لای تۆیە..!
خودایە تەنیامان مەکە.!
لە بیرمان مەکە..!
دڵی دوو عاشق،
کە وەك شێت تامازرۆی بە یەك گەشتنن
لەبەرڕەقی دڵی دایکێك لە یەك مەکە.!
لێکیان کردین..!
هەناسەم..؟
هەناسەم..!
ئەزیزی دڵی ڕەنجا و سەد جار شکێندراوم
گەرچی لێم دووری
بەڵام چاوانی سەوزو جوانت هەروان لەبەرچاوم
ئەشقی جاران و پێکەنینی جوانت

٥

هەروان لە نێو بیرو هۆشی لە دونیا دابڕاوم

لەبیرم مەکە..!

تەنیام مەکە..!

شێت و دێوانەی نێو شارانم مەکە..!

بۆت دەجەنگم بۆم بمێنە بەڵێنێکە و تا ئەبەد دەمێنێ لەسەر زارم..!

بۆت ئەمێنم و بۆت ئەجەنگم تا ئەو ڕۆژەی بە دەستت دێنم وازناهێنم..!

بۆت ئەجەنگم و بۆت ئەمێنم بەڵێنێکەوە قەت نایشکێنم..!



ئیسماعیل یاسین

# چاوەڕوانی

ئازیزم

ئەمشەویش بێ تۆ بەڕێ ئەکەم، خودا دەزانێ چەند هاوار ئەکەم

خەمی لێ مەخۆ هەربەڕێی ئەکەم

ڕاستە زۆرچاوەڕێ ئەکەم

بەس باجی هەیە و مەرگی خۆمت پێشکەش دەکەم..



٥

# ئەشك

کە دەتزانی من لە دوای ئەو
لە دەرگای هیچ دڵێك نادەم
وەك پەپولە باڵشکاوێك
بە هیچ گوڵێکی ترناگەم
ئەی جەلادی ئەشکی چاوم
ئەی بێ هەسترین کەونی عالەم
هیوا خوازم لە زەمەنێك
ببیتە پەند بۆ سەردەمێك
خۆری خۆشیت لێ ئاوابێ
تاعوونی دونیات بۆ میوان بێ
ئەو ڕۆژەی کە نامێنی
هیچ کەس تاتە شۆرت نەبێ
لە تەواوی عەرزی خودا
بستێك جێگە
بۆ ناشتنت نەبێت..



# ترسەکانم هاتنە دی

دەزانی هۆکاری ترسەکانی من چییە..؟
دەترسم ڕۆژێك هەست بکەم و تێبگەم،
کە خەمی دونیا مانای چییە
تێبگەم لەوەی،کە دڵی شکاو چەندە بە ئازارە
ئەشق چەندە دەردێکی گران و بێ بەزەییە
دەترسم ڕۆژێك دووربم لە نیگای چاوە جوانەکانت
دووریم لە بزەی سەرلێوەکانت
دووریم لە بۆنی خۆشی قژی خاوت
ترسەکانم مەهێنە دی با شێت نەبم لە هیجرانت
یان بە جلی سپی بوکێنی بۆ نێو ماڵم وەرە،
یان، کە کفنی سپییان لەبەرکردم بۆ سەرگۆڕم وەرە..



# بەرەو شێت بوون

باش نیم

ماوەیەکە،کە من باش نیم

نامەیەك دەنێرم کە دەزانم ناکرێتەوە

شیعرێك دەنوسم دەزانم ناخوێندرێتەوە

پێشدەکەنم

دڵنەوایش ئەدەمەوە

بۆ عیشقی ترهەنگاو نانێم،

هەرخەمەکان لە دڵی خۆم ئەخۆمەوە

من دڵنیام تا ئەو ڕۆژەی لە ژیان دەمێنمەوە

دەرگای خۆشی هیچ کات بەڕوم ناکرێتەوە..



# خودای گەورە

بە دەستی بەتاڵ و پڕنیازی

بە ئاهی ساردی کەساسی

بە ژینێکی نامورادی

بەڕێکەوتم بۆ وادەی مەرگ و ماڵئاوایی،

نەبوو ڕۆژێ بۆتۆ بگریم خودای گەورە

نەبوو لە ژیان بۆتۆ بمرم خودای گەورە

خودای گەورە نەمبوو لە ژیان ،

تەمەنی نوح،سەبری ئەیوب

نەمتوانی لەژیان وەك سولەیمان

تێبگەم لە زمانی احشام..!

خودای گەورە ئێستا گۆڕە ماڵ و جێگەم

ئێستا منم،

دوورلە باوەشی گەرمی دایکم

ئەو ڕۆژەی لە گۆڕ دێمە دەر

بێ دەست مایە دێمە مەحشەر

من بەندەی بێ ئاگا و گوناهکار

تۆش خودای غفورو ڕەحمان
هەرخۆت غفوری خودای گەورە
من عەبدێکی پڕگوناهم
تەنها تۆی ڕێگەی نەجاتم
بمبەخشە خودای گەورە
هەرتۆی ڕێگای نەجاتم..



٥

# پەیمان

وەرە با پەیمانێك ببەستین

ئەو كاتەی وشك و ڕەنگ زەرد و تینووی گرینگی پێدانین

ئەو كاتەی تینوی دڵۆپێك بارانی ماچین

جگە لە یەك چاو نەگێڕین بۆ بارانی هیچ ئاسمانێك

وەرە با پەیمانێك ببەستین

ئەو هەموو یادگارییە جوانەی بەیەكەوە نوسیمانەوە

هیچ بەربەستێك لە ژیان دا نەیسڕێتەوە

با قەت نەڕۆین

من بۆتۆ،تۆش بۆ من

وەرە با پەیمانێك ببەستین

قەت كۆڵ نەدەین

قەت نەترسین

قەت نەگرین

قەت یەكتری لەبیرنەكەین

وەرە بۆ یەكترئاسمان و مانگ بین

وەرە لەگەڵ یەك ماسی و دەریا بین

وەرە لەگەڵ یەك چرای شەوە تاریکەکان بین

وەرە لەگەڵ یەك هۆکاری بەڕێکردنی ڕۆژەکان بین

وەرە،با وەك جاران من بۆت باشترین پیاوی دونیا و

تۆش جوانترین کچی شار بیت

وەرە،با لەگەڵ یەك لەسەر یەك ڕێگا بین

وەرە،با چیرۆکی ئەشقێك بنوسینەوە

مێژوو هیچ کاتێك بەخۆوەی نەبینێتەوە

با وابکەین چیرۆکی ئەشقمان وێنەی نەبێت

وەرە،با لەسەر پەیمان بین

گەر لەم دونیاش پێك نەگەشتین

لەو دونیا بە یەك شاد بین

ئەو ڕۆژەی،کە مردین چیرۆکمان بۆ بنوسرێتەوە

با وابکەنین دوای مردنیش

ناوەکانمان لەگەڵ یەکتر بخوێندرێتەوە.



# ئیلاهی

ئیلاهی دەبێ چ هەستێك بێ
ویستی دڵم و قەدەری تۆ یەك شت بێ
ژیان تەواو جوانە کە بە قەدەرت بەڕێوە دەچێ
ئیلاهی بە پێنوسی میهرەبانی،
ناوی ئێمە لەگەڵ یەکدا بنوسەوە
بە قەدەرە جوانەکانت پێمی شاد بکەوە
بە ڕەحیمیت شادمان بکە و
بە غفاریت بمان بوورە
بە سۆزی خۆت
دەرگایەکت لێمان داخست
دەرگایەکی ترمان بەڕودا بکەوە
لەگەڵ یەکدا پیرمان بکە و
هەربۆلای خۆشتمان بەرەوە..



# کۆچ

گیانم،

کەی دێیتەوە..؟

ئێستا لە دوریت

ژینم پەرێشان بووە..!

لە جێگەی تۆ سیگارەکەم دەستەکانمی توند گرتووە

بگەڕێوە گوڵم «خۆت دەزانی چەند سەرە ڕۆم،»

نەیەیتەوە جێی دەهێڵم

شەقامی ئاشقانی جاران و

پیاسەی نێو گوڵ زاران

ڕۆژێك دادێ جێیدەهێڵم و منیش دەڕۆم

ڕۆژێك دادێ دەڕۆم بۆ سەفەری مەرگ

جێی دەهێڵم ئەم وێرانە و ژیانە تاڵە

بە جۆرێك هۆگرمی

بەرگە ناگری بۆ ئەم دابڕانە..



# بوختان

ئازیزەکەم گوێت لە چی بووە..؟
باسی منیان چۆن بۆ کردووی
باوەڕ دەکەی ئەم دڵەی من،
چرکەیەکیش بێ یادی نەکردووی..؟
باوەڕ دەکەی بۆ چرکەیەکیش بێ هیوام نەکردووی
هەناسەکەم باسی منیان چۆن بۆ کردووی..؟
کێ زەفەری بەم دڵە ناسکەت بردووە
هەر ڕوداوێك دڵتەنگت کات لە من نەبیندراوە
هەروشەیەك دڵگیرت کات لە زمانم نەبیستراوە
بۆ چرکەیەکیش بێ وەفایم نەنواندوە،
عیشقی تۆم بۆ زەمەنێك لە دڵمدا هەڵ گرتووە
ئەزیزی من،بەغیل بوون بە عیشقی پاکی ئێمە
چاویان بەرایی نەدا ئێمە پاك بین
چاویان بەرایی نەدا ئێمە دوان بین
بۆیە بێ ڕەحمانە لێکیان کردین..

# ئێمە و باران

ئێمە بارانمان خۆشدەویست،

هیوا خواز بووین ڕۆژێك لەگەڵ لێزمەی باران،

سەمای خۆشەویستی بکەین

ئەو پایزەی یەکەم دڵۆپ باران باری

دەست لەناو دەست بەدەم پیاسە

هیوا خواز بووین لە داهاتوو وەك و دوو شێت

لە شەقامەکان پیاسە بکەین

ئێستاکانە دوای پایزێك

ئەمڕۆ یەکەم دڵۆپ، باران باری

ئاخۆ دەبێ چەترت لابێ..؟

ئیرەیی دەبەم بەو دڵۆپەی بەرتۆ دەکەوێ

ئیرەیی دەبەم خۆزگە ئەو دڵۆپە بوام،

کە لە هەشت ملیارکەس بەرتۆ دەکەوێ

ئیرەیی دەبەم بەو هەورەی چاوت تێ دەبڕێ

ئیرەیی دەبەم بەو بایەی خۆی لە جەستەت دەئاڵێنێ

ئیرەیی دەبەم گەرئەو بایە،

بۆنی تۆ بۆ کەسێکی تر بەرێ

خۆشەویستم خۆت داپۆشە نەوەکا سەرمات بێ

باران وەرە، هیچ شتێك وەك تۆ ئاگری ناخم ناکوژێنێتەوە

وەك چۆن هیچ باوەشێك وەك ئەو،

بەفری دڵم ناتوێنێتەوە

دەبمە باران بۆت

کاتێك لە ئاسمان دادەبڕێم

دێمە باواشی شەیدای تۆ

کە لە هەورەکان دادەبڕێم

دێمە جێژوانی جارانی تۆ

ئێستا منیش تەنیام وەك تۆ

باوەڕبکە غەریبەیەکم لە زەوی

منیش دابڕاوم وەك تۆ

وەرە با عەسرەتی دوری لە ژیان لابەرین

وەرە لەگەڵ یەکتر هەرچی خەمە سەری بڕین

وەرە با بە باوەشی شادی و بارانی ماچ

هەرچی ناحەزمانە لە بن بەرین

ئێستا من دڵ شکاو و تۆ ژاکاو

من مەجنونێکی ڕێگەی عەشق،

تۆش لەیلایەکی بێ چارە و داماو

ڕۆژێك دادێ ئەم دورییە دەبڕێتەوە

لە ئێوارەیەکی نم نم باران

لە پیاسەیەکی ژێرباران

بە سەمایەکی ئاشقانە

بە وەفایەکی نەبڕاوە

بەیەکەوە دەژیەینەوە

تا ئەبەد لەگەڵ یەکتر دەمێنینەوە

پێم وتویی و دیسان دەیڵێمەوە

بۆت دەجەنگم و بۆت دەمێنم

تا ئەو ڕۆژەی بەدەستت دێنم

وازناهێنم..



# پرسیارێك

خۆ دەزانم هیچمان باش نین،

لەم پایزە هەڵوەریوە

خۆدەزانم هیچمان باش نین،

لەم بەهارە گوڵ نەدیوە

هیچمان باش نین

لەم زستانە بێ ڕەحمەدا،

ئەرێ پرسیارێك بۆتۆ..؟

چ هەستێکە بەریەستی ڕێگای دوو عاشق بی..؟

چ هەستێکە دووری نێوان دوو ڕێگابی..؟

دڵت ئازارت نادات؟!

ئاهی ساردی دوو ئاشق بریندارت ناکات؟!

لە ڕۆژ دا ژیانت ماوە..؟

لە ژورێك کۆرپەکەت دەگری،

لە ژورەکەی تر خەوت ماوە..؟

هیچ ویژدانێك لە تۆ دا ماوە..؟

# چۆلەکەی دڵم

چۆلەکەی دڵم ئێستا باشی..؟
وەك ئەو کاتەی لەگەڵما بووی بەنازی..؟
وەك جاران ئاشقی گوڵی سورو گوڵی نازنازی..؟
وەك جاران ڕەنگت لەبەرماوە..؟
هیچ بەیانییەك ماچت پێ دراوە..؟
هیچ شەوێك شەو شادت لێ کراوە..؟
نا.!
بڕوا ناکەم کە تۆ وابی،
وەرە باپێکەوە بخوێنین بە وێنەی کەناری و بول بول
وەرە تاوێك پشوو بدەین بە گیان و دڵ
وەرە با هەتاك و ماوین لەسەرسینەی وەفا،
لە یەکترنەکەین سڵ، وەرە با بەیەکەوە بجەنگین
ئای لەو جەنگەی کە خەڵاتەکەی تۆ بی
ئای لەو خەڵاتەی کە ڕەنجی چەندساڵەم بی
وەرە با پێکەوە حاڵی خۆمان بە ئاهێکی سارد و بە
دەستێکی لەرزی و بە نیگای نزا و بە چاوی پڕفرمێسك

عاواڵەی حەرشی خودای بکەین

دڵنیام خودا قەت بێ هیوامان ناکات

دڵنیام خودا دوو عاشقی ڕاستگۆ

قەت لە یەك ناکات

دڵنیام خودا،

قەت بێ ئومێدمان ناکات..



# لێم ببورە

لێم ببورە کە تۆم ناسی،

بەهاری تۆ هێشتا گەنج بوو

بڕوا بکە ئەو دڵەی تۆ

شایەنی هیچ خەمێك نەبوو

لێم ببورە کە فێری خۆشەویستیم کردی

لێم ببورە کە هۆگری عیشقێکی پاکم کردی

لێم ببورە ئەو کاتانەی خەیاڵەکانم،

بیرو هۆشت داگیر دەکەن

لێم ببورە بۆ ئەو خەمانەی،

فرمێسك بە چاوانت دەدەن

بڕوا بکە ئەو ڕۆژانەی کە ناتبینم

ئەو ساتانەی لە چاوانت ڕادامێنم

هەموو ساتێك مردنێکە،

ئەشکەنجەیە و فەنا بونێکە

ئەی ناسکترلە گوڵ

ئەی فریشتەی پڕلە پاکی

ئیشقەکەی تۆ بێ کۆتایە،

دەریایەکە و لە بن نایە

بەڵام چی بکەم عیشق وایە،

لە ژیان دا زۆرناخۆشی تێدایە

لێم ببورە عیشق وایە،

دەمێك خۆشییە و

دەمێك ئازاری بێ کۆتاییە..



# نەفرەت

خۆشم ویستی سەرشێتانە،
لە ڕوی دونیا بوم بە دێوانە
ئاڵودە بووم بە چاوانت،
تەواو شێوام بە هیجرانت
خۆشەویستیم بێ سنوربوو،
وەفاداریم وێنەی نەبوو
نەفرەت لەوەی لێکی کردین..!
نەفرەت لەوەی کە پێی کردین..!
نەفرەت لە گشت ئەو دەمانەی،
کە بە درۆ بە فرمێسکیان شاد کردین..!
جەنگام بۆتۆ سودی نەبوو،
زۆر داوام کرد هیچ نەبوو
هیچ ویژدانێك لەلای ئەوان، بونی نەبوو..!
گەر پێت نەگەم، بۆ بڵێم ژینم هەبوو..؟
گەر پێت بگەم؟!
بڵێن شا بوو..!

# دوو کۆتری ئازاد

دوو کۆتری ئازاد بووین،لە ئاسمانی ژین

پاییزهات و زەرد و هەڵوەریوی کردین

زستان هات و لانە ڕوخاوی کردین

منداڵەکانیش،بە بەرد تێیان گرتین

لە ئاسمانی ئازادی کۆت کراین

لە قەفەزی دوری دیل کراین

بۆ گەشتن پێك باڵشکێندراو کراین

ئیترلەگەڵ یەك زۆر دورخراین

ئاخۆ گوڵێ دەبێ ڕۆژێ بێ ئازاد بین..؟

وەك جاران دوو بە دوو هەڵفڕین..؟

لە ئاسمانی ئازادی لە شەقەی باڵ بدەین..؟

تا بۆ ئەبەد ئازاد بین و هەڵفڕین؟!

دوو کۆتری ئازاد بین و

قەت بێ یەك نەژین..



# ڕێم پێ بدە

ڕێم پێبدە جارێکی تر،
بە لیقای تۆ شاد ببمەوە
ڕێم پێبدە تەنیا جارێك،
بە هەناسەت بژیەمەوە
ڕێم پێ بدە جارێکی تر،
چاوانم بە ڕوی مانگ ئاشنابێ
ڕێم پێ بدە وەك شنە با،
وجودم لە جەستەت بئاڵێ
ڕێم پێ بدە دوای ئەمانە،
ئیترخۆری ژین ئاوابێ
ڕێم پێ بدە گەڵای حومرم،
هەمووی لەگەڵ تۆ هەڵوەرێ
ڕێم پێبدە دەستت بگرم،
لێرە دورت بخەمەوە
ڕێم پێبدە لەگەڵ یەکتر،
ژینێکی ترسازکەینەوە

ڕێم پێبدە باوەڕبکە عاشقێکم ،

چەندین ساڵە گیرۆدەی تۆم

نەهامەتی و دوری سۆمات،

تەوای وجودی پەڕپەڕکردوم

ئێستاکانە خەم لە جێگەت،

هەموو ژیانی داگیرکردوم

ڕێم پێبدە..



# گلەیی

شیرینم گلەیم لێت زۆرە
لە دڵمایت بەڵام دوری
وەك ئەو کاتەی لەگەڵما بووی،
نامەکانم ناخوێنیتەوە
وەڵامی پرسیارەکانم،
بە وشەی قەدەر پڕ دەکەیتەوە
گوڵم ئاخۆ دەبێ بگەڕێیتەوە..؟
وەك جاران بملاوێنیتەوە..؟
دڵە منداڵئاسایەکەم، ژیر بکەیتەوە
بە نیگاکانتم شاد بکەیتەوە
وەکو جاران گۆرانیم بۆ بڵێیتەوە
بۆ ئەوماڵەی خەیاڵمان بۆی دروست کرد،
بگەڕێیتەوە..؟
گەر بێیتەوە، تاجێکت دەخەمە سەر لە گوڵ
دیارییەکت پێشکەش دەکەم بەناوی دڵ
ژیانێك بژین قەت لە تۆ نەکەم سڵ

لاوانەوە بکەین بۆ دڵ

وەك جاران پیاسە بکەین و

پێش کەشتی کەم چەپکێك گوڵ

بەڵێن بێت گەربێیتەوە،

ڕۆحم پێشکەش بە تۆ نازگوڵ..



# ساردی

هەست بە ساردی دەکەم،کەچی کەش و هەوا گەرمە
هەست بە تەنهایی دەکەم،
کەچی هەمبوو لێم ڕۆشتووە
بە دایکم بڵێن ڕۆشتوە بۆ وڵاتی غەریبی و بێ کەسی
با نەزانێ،ئێستا گۆڕە ماڵ و جێگە و گشت کەسی
دەزانم ئەوە ڕێگە ڕاستەکە نییە
بەڵام عاشق،چاوێکی بۆ بینین نییە
ئاواتم بوو کە پێی بگەم
لە دوری ئەو،
ڕێگە ناگرم..



ئیسماعیل یاسین

# چیرۆکی خۆشەویستی

بیرتە پێت وتم، خۆشم دەوێیت دڵم

تۆزێك تاسام،فکرم کردەوە

نەوەك ئیشقەکەت سەرم خواتەوە

دوای وتم من زیاتر گوڵم

پێشکەشت بێت

ڕۆحم ،دڵم

لەو ڕۆژەوە وەك پوپولە باڵشکاوێکم

لەسەرچڵم

ڕێگای هاتنەوەت دەپێوم

دەتوت بۆ دڵم تانیا تۆ بەسمی

لەدونیادا هەرتۆ گشت کەسمی

دەتگوت لە دونیا بەس تۆم خۆش دەوێ

دەمرم گەرڕۆژێك وشەی خۆشم دەوێی بەرگوێکانم نەکەوێ

خۆشەویستی تۆ بۆم تاقانەیە

لە ڕوی تۆ دونیا گشت بێگانەیە

دەتگوت لە دونیا دەبمە هاوژینت

٥

## پەیامی دڵ

دەتگوت منت بوێ،دەبمە ئەوینت

بۆ ژێرباران چەترت و شەوانیش دەبم بە سەرینت

ئێستا کزو مات عاڵم شێواوە

ڕۆژو شەوان لام گرینگ نەماوە

دەتوت لە دوریت یەك ڕۆژنامێنم

حەزدەکەم شەو و ڕۆژلە جوانی چاوانت ڕامێنم

دەتوت پێت بگەم دونیا هی منە

پێت نەگەشتم و خەمەکانم

دەریایەکی بێ بنە

دەتوت بۆ ژیانت دەبمە ڕوناکی

ئێستاش لە دڵمدا، هەرتۆ هۆکاری تاریکی

ئێستا گشت خەونمی تەنیا تۆم دەنێ

لەگەڵ تۆ خەمەکانیشم پێدەکەنێ

ئێستاش لەسەرپەیمان بەو دڵم مەشکێنە

لە دوری باڵات زیاترمەمشێوێنە

ئێمە لەگەڵ یەك تەنیا دوان بووین

بەڵام بۆ یەکترهەموو دونیا بووین

لە ژیان دا بۆ یەك هەوا بوین

لە تاریکیدا مۆم و چرا بووین

ئیسماعیل یاسین

زەمەن هات و ڕۆی هۆگری یەك بووین

ڕۆژێك بێ یەكترزۆرسارد و سڕبووین

جارێك بۆی مردبام سەد جاربۆم ئەمرد

داوای دڵمی كرد ڕۆحم پێشكەش كرد

زەمەن هات و ڕۆی هەمووی پێی زانی

زۆربێ ڕەحمانە لە یەكیان كردین

ئێستاش بە هیوای یەكتری ئەژین

تەنها ڕۆژێك بە ساڵێك ئەبڕین

خۆزگە دەكرا زەمەن بگەڕێتەوە

جێژوانی جارانت دڵم بلاوێنێتەوە

ئەوەی باسم كرد چیرۆكی من بوو

كە چۆن بەد كارێك هۆی جودایی بوو

ئێستاش تا دەمرم هەربە هیواتم

گەرسەد ساڵیش بڕوات هەربە تەماتم

گەرسەد ساڵیش بڕوات هەربە هیواتم..



# ئازیزترینی

ئێستاش ئازیزترینی

خۆ ئاگات لێ نییە، بەڵام دڵ دەیزانێ

خۆ نامبینی، بەڵام خەیاڵم لێت دانابڕێ

مەیشارەوە

ئەگەر دەڕۆی ئازادی!؟

دڵم دەنێژم بێ سەبوری

مەیشارەوە

بە ئازارە بێ هەواڵیت، گەلێ تاڵە بێ سەبوریت

نەمدەزانی ئیشقت وایە

نەمدەزانی قەدەروایە، بەیەك نەگەشتن

بێ وەفایی و قەدەریش جوانترین بەهانەیە،

مەیشارەوە

زۆرزەعمەتە ژیان بە بێ تۆ

وای لە قەدەر

ناگەم بە تۆ..

# بۆ بێدەنگی..؟

بۆ بێدەنگی کە دەزانی،بە دەنگی تۆوە ماوم» ״

بۆ بێدەنگی کە دەزانی،لە خەوی شەو دابڕاوم

بۆ بێدەنگی بێ لە دەنگت،لە گشت دەنگێك دا بڕاوم

بۆ بێدەنگی بەڵێن وابوو بۆم بمێنی

بەڵێن وابوو لە دوری خۆت،

فرمێسکی چاوانم نەتۆرێنی

بەڵێن وابوو بە ڕۆشتنت نەمشێوێنی

بۆ بێدەنگی بەڵێن وابوو،

لەگەڵ خۆت دا بمخەوێنی

بەڵێن وابوو بە گوێما بچرپێنی



بۆ بێدەنگی بەڵێن وابوو بەیەك بگەین

بەڵێن وابوو گشت شادییەك بۆ یەك بکەین

بۆ بێدەنگی ئێستاکانە، زۆرتوند پێمەوە لکاوی

بۆ بێدەنگی وەك جێناوێك لەگەڵ ناوەکەم دا ماوی

بۆ بێدەنگی لە عیشقێکدا،

کە تا ئەبەد پەیوەست بە یەك کراوین..

# بێ تۆیی

کە تۆ نەبی چۆن بژیم و هەموو ڕۆژم مردن نەبێ..؟

چۆن پێبکەنم و ڕوم خۆش بکەم..؟

کە خەندەی ڕاست لەسەرلێوەکانم نەبێ..!

چۆن ببمەوە بەوەی جاران..؟

کە هیوایەك لە دڵ نەبێ؟!

خۆشی ژیان ڕوم تێناکات هەروەك باران..



# دەمەوێ کتێبێکت لەسەر بنوسم

دەمەوێ کتێبێکت لەسەر بنوسم،
پڕاو پڕ بێ لە وشەی پڕ هەست
پڕاو پڕ بێ لە شیعری جوان
بەڵام داخی گرانم،
شیعرەکانم زۆری ماوە
بگات بە جوانیت ئەی مانگ
دەمەوێ سەد شیعرت بۆ بنوسم
ڕازی دڵم بدرکێنم
ئەو ڕۆژەی کە پێت دەگەم،
لەگەڵ چەپکێك گوڵ
پێشکەشت بە تۆی دەکەم..



# جێم مەهێڵە

بڕوا ناکەم جێمبهێڵی،خۆتۆ ئەتوت بێ تۆ ناژیم

هەموو شەوێك بۆتۆ ئەگریم،خۆتۆ ئەتوت من بێ زیانم

کەی دێیتەوە بیرت دەکەم،شەوێك نییە یادت نەکەم

ڕۆژێك نییە بۆ سەلامێك،ڕوو لە ئاسمان دوعا نەکەم

شوێن نەماوە بۆت نەگەڕێم،خۆ ناتوانم لەبیرت کەم

خودا شاهێدە شەو و ڕۆژ،تەنها داوای تۆی لێدەکەم

هەربە هیوام بێیتەوە لام،ئاخرلەکوێی بێ تۆ تەنیام

بەبێ تۆ خۆ بۆم ناکرێ،بێبەشم لە هەردوو دونیام..



٥

# شایستەی نەبووین

ئێمە شایستەی دابڕان نەبووین

ئێمە لەگەڵ یەك فێری وشەی خۆشەویستی بووین

هەم لەگەڵ یەکتر بە مانای دابڕان ئاشنا بووین

ئەزیزم گەرچی دوریمان زیاتر درێژە بکێشێ

عیشقی پاکت هەمیشە لەناو دڵ و دەرونم دەمێنێ

هاموان دەزانن عیشقی ئێمە جیاواز بوو

بەڵام قەدەری خودا وابوو

تۆ بە خەمی کۆمەڵ بە گا و

ئەم شاعیرەش بە قەڵەمێك وابەستەبوو..



# سێگۆشەی هیوا

دوو هێڵی تەریب هەرگیز یەکتر نابڕن

سێگۆشەش ئەگەر هەرسێ هێڵەکە لەگەڵ یەك نەبن

ئەوە هەرگیز بە سێگۆشە هەژمار ناکرێ

ئەگەر دوو دڵدار بۆیەك نەچەمێنەوە هەرگیز

چەقی سێگۆشە درووست نابێ

ئەگەریش کۆمەڵگا و خێزان هاوکار نەبن

هەرگیز سێگۆشەی خۆشەویستی دروست نابێ

هیوا و پلان و جوانی

سێ هێڵی تەواو کەرن بێ یەك مانایان نییە

عیشق بەبێ هیوا بوونی نییە

بەبێ پلانیش هیچ بەیەك گەیشتنێك بوونی نییە

کە خێزان و کۆمەڵگاش ڕێگر بن لە سێگۆشەی هیوا

هیچ جوانی و جەماڵێك نایەتە ئاراوە و تا سەر نییە..



# مانگ

لە مەکتەب وا خوێندومانە ساڵ ١٢ مانگە
لە چوار وەرزیش پێك دێت
بەڵام من مانگێکم ناسی ١٤ ساڵ بوو
کە خۆشم ویست ١٥ ساڵ بوو
کە جێی هێشتم ١٦ ساڵ بوو
کە ناسیم ژینم سەرتاپای بەرگی بەهاری پۆشی
کە جێشی هێشتم
شەوی تاریك و دوکەڵ و زوخاوی پێم نۆشی
کەواتە نە ساڵ ١٢ مانگە
نە چوار وەرزە،تەنها دڵی منە
بۆتۆ مەستە..



# بینین

ئەمڕۆکە دوای ئەو هەمووە کە تۆم بینی

بەرچاوانم تەنها ڕەشی دەبینی

ئەو دەستەنای دەستی دەگرتی

ئێستاکانە پێت ناگەن

ئەو نیگایانەی تێئەگەشتن

ئێستاکانە بێ وەڵامن

ئەو قاچە پتەوانەی دەوەستان و بەرزم دەکردیتەوە

ئێستاکانە ڕێناگرن و لەرزۆك بووە

ژینم لەدوای تۆ تەواو بێ سود بووە

ئازیزەکەم ئاگات لێییە ئەم زستانە چەندە ساردە

ئەم بارانە دادەماڵێ و تەڕمان ئەکات

تازە نییە ئەم زستانە

چەند مانگێکە تازاندومی

ئەم بارانە نامۆ نییە

چەند مانگیکە داباریوە و شکاندومی

ئەم بایە ساردە بای دڵ ڕەقی ئەوەیە لێکی کردین

ئیسماعیل یاسین

ئەم بارانە خۆشەویستیمانە و بەرگری لێکردوین

ئەمڕۆ بارانم زیاتر خۆشویست کە بەسەرمان ئەیباراند

بەڵام ڕقم لە بای سارد بویەوە کە یارەکەمی تەزاند

بێ دەسەڵاتی خۆشم لەم لاوە کە یارەکەم سەرمای بوو

نەمگرتە باوەش، کە باران دەباری دەستەکانم

بۆی نەکرد بە چەتر، ئازیزم دابڕان سەختە

کە ناتبینم و گوێبیستی دەنگت نابم

دوای چەند مانگێك وردە وردە دڵم دەمرێ

هیچ هەستێك لە وجودم نامێنێ

کە لە پڕ دەتبینم و دەنگت دەبیستم

دوبارە دڵم دەژیەتوە و هەموو ئازارەکان دەگەڕێنەوە

بە جۆرێکم لێهاتووە دەمەوێ هەبیت

بەڵام نیگای کورت و قسەی کەم ئارامم ناکاتەوە

تەنها بۆ ئازارە دوبارەکانم دەباتەوە..



# بەڵێنمان دا

بەڵێنمان دا بۆ من بژیت من بۆی بمرم
بەڵێن وابوو تا دوا هەناسە دەستبەرداری یەکترنەبین
بەڵێنمان دا لە بیابانی وشکەساڵی دەم بۆ قومێك لە
ئاوی بێ وەفایی نەبەین
بەڵێنمان دا بۆ یەك بژین بۆ یەك بمرین
قەت کۆڵ نەدەین قەت نەترسین قەت نەگرین
بەڵێنم دا باسکم بکەم بە نەرمترین سەرین بۆ نوستننت
بەڵێنم دا باوەشم بکەم بە گەرمترین باوەش بۆ ڕازی دڵت
ئەوینم کەس هێندەی من پەست نابێ بۆ گریانت
کەس هێندەی من دڵخۆش نابێ بۆ پێکەنینت
کەس هێندەی من خۆشی ناوێی
کەس هێندەی من بۆ گەشتن پێت
شەڕی گشت بەدکارێك ناکات
بەڵێنم دا دڵ ناشکێنم
تا بەدەستت نەهێنم
وازناهێنم..



# خۆشەویستی چەترو باران

خۆشەویستی چەترو باران
درۆیەکی زۆرگەورەییە
هەرئاسمان دەبارێنێ و
چەتریش لە ڕوی دا سپڵەیە
منی عاشق سەرشێتانە
عاشقت بووم ، دێوانە بووم
دڵە نەرمونیانەکەم ئێستاکانە ڕەق بووە
عیشقە بێ پایانەکەم بێ سوود بووە
بۆتۆ جەنگام بۆتۆ سوتام
من لەبەرتۆ هەرهاوارم بەدەم هات
تۆش لەبەرمن سەلامێکت بە دەم نەهات
عەسرەتێك بۆ بینینم ناتگریەنێ
فرمێسکێك لە چاوانتا ناتکێنێ
تۆ بێ باك و منیش عاشق ڕێگامان زۆرلێك دورە
ئێستاکانە لێت بێ باکم
گەرببیت بە شەمیش

ئێستاکانە بە دڵسۆزت نازانم
مەشترسە من لە دوای تۆ
لە دەرگای هیچ دڵێك نادەم
قومارچییەکی دۆڕاو و
عاشقێکی دڵ شکاوم
تاکوو ئەبەد خۆم بە شایەنی
عیشقێکی باشتر دەزانم..



# مەعشوق

وێنای ئاسمانێکی بێ مانگ دەکەم

وەك و دڵی عاشقێکە بێ مەعشوقەکەی

ئاخۆ نەمانی مانگ لە ئاسمان

دڵی چەند عاشقی بێ مەعشوق دەشکێنێت

لە شەوانی بێداریدا

هەرچەندە عاشقیش لە مانگ دا

تەنیا لە شەوان دا وێنەی مەعشوقەی لێ دەبینێتەوە

بەڵام چی ئەگەرئەوەش نەما

ئاخۆ چی بکا

ئەم دڵە شێت و بێ چارە..



# شێت بوون بۆ تۆ

شێت بووم ئەوەندەی بڵێم تۆ

شێت بووم ئەوەندەی بڵێم بۆ

شێت بووم بەبێ هۆ لەسەرتۆ

شێت بووم ئەوەندەی بڵێم بۆ

لەبەرتۆ..



# بە یەك ناگەین

بە یەك ناگەین
تا لە یەك نەگەین
لە یەك گەشتین
بەڵام پێك نەگەشتین
چەشنی دەردین
بەڵام بێ چارەین
بۆ یەك مەستین
بەڵام نەویستین
لەناو دڵی یەك
باشترین کەسین..



# نیگارکێشێک

نیگارکێشێک نیم
بەڵام کە دێیتەوە خەیاڵم
وێنەی خەیاڵم دەنەخشێنم
کە چاوانت دێنە خەوم
جوانترین تابلۆی بۆ ئەکێشم
تا پێت بگەم
تابلۆی ئازادی دەنەخشێنم
ژن ژیان ئازادی
بە ڕەوای هەقتی دەسەپێنم..



# تۆ ماناتـ چییە؟

باران مانای چییە گەربەدەم پیاسە تەڕمان نەکات

بەفرچییە گەرلە خۆی دا شادمان نەکات

گەرلەگەڵ تۆ سەیران نەکەم

نەورۆزی کوردیم بۆ چییە؟

گەردوو بە دوو پیاسە نەکەین

پایزمانای چییە؟

خۆشەویستی مانای چییە گەربەیەکترشادمان نەکات

ژین مانای چییە گەرلەگەڵ یەك پیرمان نەکات

عیشق مانای چییە گەرتاڵ و شیرینمان پێ نۆش نەکات

تۆ ماناتـ چییە گەرژیان بە منت شاد نەکات..



# پێکگەیشتین

خۆشم ویستی

نەك تۆشم خۆش بوێت

لە شوێنی غیرە کردن متمانەم پێ کردی

ترسم نەبوو لە ڕۆشتنت

وەفاداریت متمانەم بوو

بەقەد گوڵێك جوانی

ئازیزم دڕکەکەشت بەرهەم دارە

شیعرەکانم نمومەی ئازارە

دوری نێوان دوو کەس لەیەك نەگەشتنە

ئێمە تێگەشتین

بۆیە بەیەك گەیشتین..



# خەون

ئازیزەکەم نەهاتە دی خەونەکانمان
نەهاتە دی گشت خەیاڵ و خۆزگەکانمان
دولبەرم ئێستا سینەم بێ تۆ چۆڵە
ئەو دڵەی کە تۆ بردت
بێ ئاکامە و سەرەو شوێنە
فریشتەی من دوای جودایت
ژینم سەرتاپای وێرانە
چاو دەگێڕم بۆ گشت شوێنێك
لە کەس نابیستم پەیامێك
دولبەرم کە تۆ زینی منیش مەمێك
با بیکێشن هێڵی سورێك
لە بەینی ئێمە بۆ زەمەنێك
دەیشکێنین گشت هێڵێك
من لە پشت تۆ ،تۆش لە پشت من
بەدەستی دەهێنین خەڵاتێك
ژیانێك پێکەوە، بۆ تەمەنێك..



# لەبیرم ناچن

مەگری ئەزیزم گریان لە چاوت نایە

چاوانی تۆ شایەنی هیچ گریانێك نییە

لەبیرم ناچن ئەو شەوانەی بە تەنهایی

خودا دەزانێ کە شەو ڕۆژ بەدەم نزا

بۆت ئەگریام تا بەیانی

ئێستا کانە نە من ئەگریم نە تۆش بگری

تۆ دەزانی بەیەك گەیشتن خەیاڵی شاعیرەکان نییە

گەر وەفا هەبێت هیچ شتێك مەعاڵ نییە

تێگەیشت واتە پێك گەیشتن

وەفاداری واتا لێکگەیشتن

کە تێگەشتین ئیتر بە یەك گەشتین

با ئیتر نەگرین و سوپاسی خودا بکەین..



# سەدە

سەدان ڕۆژی تاڵی بێ تۆم بەسەربرد

سەدان شەویش پەیامی دڵم لە تێنوس گرت

جوانی تۆشم لە شیعرێك دا پێناسە کرد

نزاکانم لەلای خودا داوا کرد

هەرچی درۆ و خراپیان بوو

خودام بۆیان بە شاهێد کرد

ڕۆژەکانم بە یادی تۆ بەسەربرد

بەڵێنکت ئەم شاعیرەی بە هیوا کرد

دەستەکانی هۆگربە قەڵەمێك کرد

ئیترخودا بە تۆم شاد کات

دەڵێم خودا سوپاس بۆتۆ

کە نزاکانمت گیرا کرد..



# دواین پەیام

خەیاڵم کرد کە لەگەڵ تۆ

ئەوینی ئەم دوو دڵە

بکەم بە مێژووی عیشقی پاکم

لە داخی دووری تۆ..!

نەفەسم هێندە قەتیسە دوای پەیامی کۆتات،

وای لێکردم بڵێم عیشق چەندە بە ئازارە و

دۆڕاوی عیشق چەندە شکاو و غەمگینە.

بەبێ تۆ ئەستەمە مانم

بە ڕەنگ و ڕوو ئەگەرشادم

دڵم دەریای خوێنینە

هەناسەی ئاخریشم هات

نەهاتی گیانی شیرینم،

ئاخرخودا کەی دوری ئەزیزانم بە کۆتا دێ..؟

ئاخۆ کەی بێ من پێی شاد بم

یاخود مەرگ بۆم میوان بێ؟!

زۆرهەوڵم دا هەرمنداڵ بوو

هەرپێنەگەشت

زۆرهەوڵم دا بتترسێنم

بە ڕۆشتنم بە غەریبی و بە بێ باکیم

هەرتێنەگەشت

هەرمنداڵ بوو هەرپێنەگەشت

لێم بێ باك بوو خەمێکیشی بەخۆی نەهێشت

دوا پەیامت سەرتاپای دڵی سوتاندووم

بیرمە وتی،

گەردنم ئازاکە کە هۆگرم کردی

زۆربە ئاسانی

سەرتاپای خەون و خەیاڵمی کوشت لەگەڵ خۆی،

هەرتێنەگەشت هەموو بیانوو بوو بێ منەتیم

وای ئەزانی بەڕاستمە و هەرتێنەگەشت

لە عیشقم دا هەرخۆی زاڵ بوو

قەت پێنەگەشت.

لاسارانە سووربووی لەسەرپەیامی کۆتات

منت لەلا گرینگ نەبوو،

ئاخرگوڵم خەونی هەموو شەوانی من چاوی تۆ بوو

هیوای هەموو ڕۆژێکی من عیشقی تۆ بوو

نیگەرانی منی کە بە ئازارە دڵم..؟
بۆ بینینت چەند مەست و سەرەڕۆم..!
غەمی پێ مەخۆ قبوڵم کرد دوا پەیامت
تۆ وەك جارانی و منیش
خەمی تۆ و خەمەکانی خۆشم ئەخۆم
هەزارڕۆژە و بەڕێی ئەکەم
بەڵام مرۆڤێك بە هەزارخەم
دەترسم هێندە بگۆڕێم
خۆشم خۆم قبوڵ نەکەم..



# ئارام دەگرم

هەموو کوچێکی ئەم شارە یادی ئێمەی پێوەیە

هەموو کۆڵان و شۆستەی شار

دەنگی دڵتی لێوەیە

ڕۆژێك دادێ دەتبینمەوە باسی ئێستامت بۆ ئەکەم

بەڵێن بێ تا ئەو ڕۆژە هەرگیزلەبیرت نەکەم

سەدان قسەی نەوتراوم کرد بە پەیامی دڵم

هەرخۆت بوویت بە سەکۆیەك بۆ ئیلهامی شیعرەکانم

تا ئەو ڕۆژەی دەتبینمەوە و پەیامی دڵمت بۆ دێنم

ئارام دەگرم ئەی مێهنازم تەنها بە خودات دەسپێرم..



# پێڕست

٥

٥

# لە کۆتایی دا

ســـوپاس بۆ خودا دواتر بۆ هەموو ئەو کەســـانەی یارمەتییان داوم لـــە زۆرتا کـــەم بۆ بـــە چـــاپ گەیاندنی ئـــەم کتێبە،بە تایبەتـــی خێزانەکـــەم و هاوڕێیـــە نزیکەکانم وە سوپاســـێکی تایبەت بـــۆ (د.ســـۆران مامەند)کە ئەرکـــی پێداچوونەوەی کتێبەکەی گرتە ئەســـتۆ وە ســـوپاس بۆ خاتوو(نیگا ئەحمەد) بـــۆ ماندووبونی بە دیزاین کردنی بەرگەکـــە و ناوەڕۆکەکەی، وە ســـوپاس بۆ کاك (فریاز کەڵهوری) کـــە یارمەتی دەرم بوو لـــە چەند پارچـــە هۆنراوەیەك، وە ســـوپاس بـــۆ (م.هێڤی جـــلال باپیـــر) (م.چرا عبـــدال احـــد)وە سوپاســـێکی تایبەت بۆ (م.شـــەیدا ســـەریاز) (د.نەجـــم ئەڵوەنی) شـــاعیر، وە لە کۆتایـــی دا سوپاســـێکی تایبەت بـــۆ ئەو کەســـەی هەموو پەیامەکانی دڵمی بۆ نوســـراوە وە ســـوپاس بۆ ئەو کەسەی وای کرد بنوســـم..

**ئیسماعیل یاسین**